

# له هه‌گبه‌ی خاره خوله‌وه



سامان قه‌ره‌چوغی

**لە هەگبەی خارە خولەوە**

بۆت نووسی بووم بۆت بنووسم ئەمن چیم
دوندی قەندیل گۆڕەپانی هەڵگورد نیم
بەرەو بەرزایی دەچم گەرچی ووردم
خاکی بەر پێی تێکۆشەرێکی کوردم

هێمن موکریانی

لە هەکبەی خارە خولەوە

## ئەم کتێبە پێشکەشە بە

★ گیـــانی پـــاکی شـــەهیدە نەمرانـــەکانی کوردســـتان و بنەماڵـــە خۆڕاگرەکانیـان کـە بوونـە داینـەمۆی بـەردەوام بـوونی شۆڕشـەکانی کوردستان و دەسکەوتەکانی ئەمڕۆ .

★ بـەو شۆڕشـگێڕانەی تەمـەنی گـەنجێتیان پێشکەشـی ئـەم خـاك و نیشـتیمانە کـردوو کێـو بـە کێـو و دێ بـە دێ بـەرگریان لـە کـوردو کوردسـتان دەکـرد ! بـە بنەماڵـە تێکۆشـەرەکانیان کـە لـە ڕۆژگـارێکی سەختدا بەرگەی زیندانی و ئاوارەییان گرت .

★ بــەو کەســانەی وێڵــن بــە دوای کۆکردنــەوەی ووشــەو فەرهــەنگی کوردی .

★ دایکی خۆشەویستم کە بۆتە ڤوتابخانە بۆ پێگەیانـدن و خـۆڕاگری بنەماڵەکـەمان ، بـە خوشـك و براکـانم کـە زینـدانی و ئـاوارەیی و زەحمەتیەکی زۆریان کێشاوە لەبەر کورد بونیـان ، بـە خێزانەکـەم و منداڵەکانم کە ئومێدی ئێستاو ئایندەمن .

## پێشەکی

خەباتو قوربانیدانی گەلی کوردو قارەمانێتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە گشتیو لە نێویشیاندا هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی بە تایبەتی بە سەدان کتێب تەواو نابێت، چونکە پێشمەرگە بە کرداریش هەمان مانای بەخشیەوە!، هەزاران پێشمەرگە گیانی خۆیان لە پێناو ئازادیو دیموکراسیو سەربەخۆیی کوردستان بەختکردووە، ئەم هێزو ناوە مەزنە تا ئێستاش پێشەنگی بەرگریکردنو پاراستنی گەلەکەمانە، بۆیە گرینگە هەموو تاکێکی کوردستان گەورەییو قوربانیدانی ئەم قارەمانانەی لەبەر چاو بێت.

نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ۱۹۹۱ بەشێك لە پێشمەرگە دێرینەکان خەباتی ڕابردووی پێشمەرگایەتییان وەك فەزل و منەتێك بە سەر میللەتو حزبەکانیان فرۆشتەوەو لە قۆناغی شاریش بوونەوە بە بەرپرسی بالأی حزبیو حکومی ! لەگەڵ وەرگرتنی بەرپرسیارێتییەکانیشیان – زۆربەیان - پێگەکانیان لەپێناو دەسکەوتی زیاتری حزبیو کەسی بەکارهێناو خۆیان لە ئەرکە نیشتیمانیو نەتەوایەتیو چینایەتییەکان دامالٌیو خزانە نێو کاری گەندەڵیو بە داهاتی میللەت بوونە خاوەنی هوتێلی هەوربڕو کۆمپانیا!.

بەداخەوە ئەم زەوتکردنەی دەسەلاتو قۆرخکردنەی داهاتی گشتی لە لایەن – هەندێك - لە نەوەی کۆنەوە، نەوەی نوێی توشی ڕقو کینە کردووە ، نەك هەر شانازی بە پێشمەرگە شۆڕشگێڕەکانی ڕابردووی

خۆیان‌و نیشتیمانەکەیان ناکەن!، بەڵکو نەفرەت لەو ڕابـردووەش دەکـەن کە ئەو جۆرە کەسانەی کردووە بە پاڵەوان!. خۆشبەختانە( خارە خولە ) و هاوسەنگەرو هاوبیرەکانی بەشی زۆریان ئەو شانازیەیان بـەر دەکـەوێت کـە پێیـان بڵـێین سـەربازی ون، چـونکە تێکۆشـانی شـاخ‌و شـاریان بـۆ خۆشگوزەرانی‌و باشترکردنی ژیانی هاوولاتیـان‌و نـەوەی نـوێ بـووە، نـەك گیرفانی خۆیان!.

(خارە خولە) لەپێشمەرگایەتی پارتیزانێکی بـێ وێنـە بـووە!، لـە ڕۆژە سەخت‌و نائومێدییەکاندا، ئەو بە قسـەی خـۆش‌و سەرگوزەشـتەی پـڕ لـە سەمەرەو سەربوردەی پڕاوپڕ لـە واتـاو قسـەی نەسـتەق، هیـواو خەنـدەی خسـتۆتەوە نێـو دڵ‌و سـەر لێـوی هاوسـەنگەرەکانی ، ئـەم هـاوڕێ تێکۆشـەرە تـا ئێسـتاش هـەر پێشـمەرگەیەکی گیانفیدایـە لـە پێنـاو کوردستانەکەی! .

ئەم هەنگاوەی من خستنەڕووی لایەنە گیانفیـداکاری‌و پارتیزانییەکـەی ئـەم تێکۆشـەرە نییـە! بـە قـەد ئـەوەی خسـتنەڕووی بەسـەرهات و قسـە نەسـتەقەکانیەتی، کـە لایـەنێکی ئـەدەبی‌و کـەلتووری‌و کۆمەڵایـەتی بـەم پێشمەرگە دێرینە بەخشیوە، لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە سەربوردەکانی پڕیەتی لە پەندو ئامۆژگاری‌و پێشهاتی ڕووداوەکان، ڕاسـتە سـەربوردەکان ئـەو کاتـە دڵخۆشـت دەکـەن کـە لـە سـەر زاری خـارە خولـەوە گوێبیسـت دەبیت، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەبەر چاو بێت ئـەرکی سـەرەکی نووسـەرو ئەدیب لە نووسینەوەی زمانی قسە تەنها تۆمارکردنی ئەو زمانـە سـادەیە نییـە!، بـەڵکو کـارکردن بـووە بـۆ خسـتنە نێـو فـۆڕمێکی ئـەدەبی، بۆیـە منـیش هەوڵمـداوە لـە ڕووی ناوەرۆکـەوە تـەواوی سـەربوردەو قسـە

ئەستەقەکان بە شێوەیەکی ئەدەبی دابڕێژمەوە ، لە هەمان کاتدا بەسەرهاتەکانم لکاندۆتەوە بە رۆژگاری ئەمڕۆمان.

ئاشنا بونی من لەگەڵ خارە خولە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹۹۳ کاتێك وەك ئەندامێکی حزبی شیوعی ناوە ناوە لە بارەگای هەولێر چاوم پێیدەکەوت و گوێبیستی قسە خۆشەکانی دەبووم , پاشان بووم بە کارمەندی رادیۆی ( رێگای کوردستان ، ئازادی) کە بارەگاکەی هەر لە نێو بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێری حزبی شیوعی کوردستاندا بوو ، لە دوایدا وەرگرتنی بەرپرسیارێتی رێکخست لەو شارە وای کرد رۆژانە بە دیداری ئەو تێکۆشەرە بگەم ، زۆر جار بەڵێنی ئەوەم بە خۆم و بە خارە خولە دەدا کە تەواوی بەسەرهات و قسە خۆشەکانی کۆ دەکەمەوەو لە کتێبێکدا چاپیان دەکەم , بەڵام بە داخەوە جگە لە سەرقاڵبوونم بە کاری حزبی و ڕاگەیاندن لە هەمانکاتدا دە ساڵ ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەت و بەرپرسی راگەیاندنی ناوەندی یەکێتی لاوان بووم ، دوای ئەو دە ساڵەش سێ ساڵ و چوار مانگ سکرتێری گشتی ئەو رێکخراوە بووم بۆیە دەرفەتەم بۆ نەڕەخسا،

لە هەفتەی یەکەمی ساڵی ۲۰۱۷ بە نیازی دیداری هاورێیان گەیشتمە نێو پرسگەی بارەگا کۆمیتەی پارێزگای هەولێر ، خارە خولە وەك زۆربەی رۆژان لە تەنیشت هاورێی پرسگە دانیشتبوو، دوای یەکتر ماچکردن مستێ فستق و بەداملی وەك جاران دایەوە دەستم.

وتی: بخۆ هەر پێم دەکرێ سەیان بە خێو بکەم!

وتم: خارە شیرینییەکەت پێدام، وەك ساڵانی ڕابردوو دڵیشمان خۆش بکە بە گێڕانەوەی هەندێك بەسەرهات و قسەی ئەستەق ، تا خەمی دنیا بەبا بدەین!، ئەویش وەك نەریتی هەمیشەیی لەو رۆژەدا بە کۆمەڵێ

بەسەرهات و قسە دڵی خۆش کردم ، منیش چەند بەسەرهاتێکیانم لە لاپەڕەی فەیسبوکی خۆم بڵاوکردەوە لە ژێرناونیشانی( لە خارە خولەوە)، دڵخۆش بوونی هاوڕێیان و هاندانیان بۆ بەردەوامیم لەسەر تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم سەربوردانە بەڵێنەکەیان بیرخستمەوە ،بۆیە بە دەرفەتم زانی کە هەنگاو بنێم لە پێناو جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنە ، چونکە دەسبەرداری تەواوی ئەرك و بەرپرسیارێتیەکانی حزبی و ڕێکخراوەیی ببووم ، بۆ ئەو مەبەستە چەند دیدارو یەکتر بینینی ترم لەگەڵ خارەخولە ڕەخساند ، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە پەیڤەکانی لە زارە شیرینەکەی دەرچون و بوو بە پرۆژەی ئەم کتێبەی بەردەستتان ،

خوێنەری بەڕێز هەندێك وشەو دەستەواژەم لە سەر زاری خارە خولە نووسیوە لە ژیانی کۆمەڵاتی دەچێتە چوار چێوەی عەیبە! بەڵام بە بڕوای من ئەم جۆرە وشانەش لە فەرهەنگی کوردیو ژیانی ڕۆژانەمان داماڵدراونین، بۆیە ناکرێت لە بواری نووسین بە تایبەتیش ئەو جۆرە نووسینانەی دەچنە چوارچێوەی ئەدەبی گاڵتەوگەپ، یان تەنز، یاخود ساتیرە دابماڵین!، ڕاستە ئەم کتێبە بۆ من ئەزموونێکیتری بواری نووسینەو لە نووسینەکانی پێشووترم کەمتر خۆم خزاندۆتە نێو بواری ئەدەبییەوە، بەڵام هەموو ئەدەبدۆستێك هەست بەو ڕاستییە دەکات کە کورد لەم جۆرە گێڕانەوەو نووسینەوەی ئەم جۆرە ئەدەبە کەمتەرخەم بووە، بۆیە وشەکانم وەك خۆی تۆمار کردووە، هیوادارم وەك لاوازی زمانو کەسایەتی ئەم کارە هەڵنەسەنگێنن، چونکە کاتێك قسە لەسەر ئەدەبی (گاڵتەوگەپ) دەکرێت ڕاسترین تێڕوانین پێشەکییەکەی بەرگی یەکەمی کتێبی (رشتەی مرواری)ی نووسەرو ئەدیبی گەورەی گەلەکەمان مامۆستا (عەلائەدین سەجادی) یە کە لە ڕێکەوتی ١٩٥٢/٣/٢٤

دەنووسێت: ((لە بواری نوسین‌و خوێندنـەوەو وشـەی شـوورەیی (عەیبـە) نەیهێشتووە هیچ شتێك پێكەوە بنێین، چونكە هـەر كاتێـك كەسـێك ئـەم قسـەو سەرگوزەشـتە خۆشـانەی گێڕابێتـەوە، خێـرا پێیـان وتـووە عـەیب نییە تۆ ئەم قسە ناشرینە ئەگێڕیتەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئـەو قسـەیە كـە ناشرین وەیا پێچەوانەی ئەدەب و شەرم دائەنرێ ئەوە جەوهەری ئـەدەب و ئەقڵەو ئەدەب لەوە دروست ئەبێ! ئەدەب پەردەی ژیانی كۆمـەڵەو شـان بـە شـانی هاتۆتــە خــوارەوەو ژێــری‌و زەمینــی پێشـان ئــەدا، رابــواردن‌و هەڵسوكەوتیان ئەخاتەڕوو)) .

مەبەست لە خستنەڕووی ئەم تێڕوانینەی مامۆسـتا عەلائـەددین، ئـەوە نییـە كـە ئـەم چـەند سـەربوردەیەی منـیش چاپـم كـردووە بخرێتـە پـاڵ گەورەیی كارەكەی ئەو، تەنها مەبەستم ئەوەیە قسەكانی خـارە خولـە لـە ئاسـت وشـەكانی نـاو رشـتەی مـرواری زۆر ئاسـاییە لـە كاتێكـدا مامۆسـتا عەلائەددین جگە لەوەی ئەدیب‌و نووسەرێكی مەزن بووە، لە هەمانكاتـدا زانایـــەكی ئـــاینی‌و ســـەردەمانێكیش ئەمینـــداری گشـــتی ئـــەوقاف‌و رۆژگارێكیش مامۆستای كۆلیژی ئەدەبیاتی زانكـۆی بەغـدا، بەشـی زمـانی كوردی بووە.

هیوادارم توانیبێتم بەم كارەم خزمەتێكی بچووكی ئەدەبی میللەتەكەم كردبێت‌و لە ئاست گـەورەیی و سـادەیی ئـەو پیـاوە تێكۆشـەرو نیشـتیمان پەروەرە بێت و ببێتە جێگەی دڵخۆشی‌و ڕەزامەندیی خوێنەران .

سامان قەرەچوغی

٢٣ / ٤ / ٢٠١٨

## ژیاننامەی خارە خولە

+ ناوی تەواوی / مەحموود تاهیر مەحموود ناسراو بە ( خارە خولە ) .

+ لە ساڵی ١٩٥٢ لە گوندی ( کونە گورگ ) ی دەشتی هەولێر لە دایك بووە .

+ لە تەمەنی چوار ساڵی دایکی کۆچی دوایی دەکات .

+ تا چوارەمی سەرتای خوێندوە لە گوندی گردە ڕەشەی گەورە

+ وەك زۆربەی منداڵانی تر تەمەنی منداڵی و هەرزەکاری بە هەژاری و کرێکاری بەسەر بردووە .

+ هەر لە منداڵی و هەرزەکاریەوە وەك دۆستێك لە ریزەکانی حزبی شوعی بووە .

+ لە ساڵی ١٩٧٠ شەرەفی ئەندامێتی لە حزبی شیوعی وەرگرتووە .

+ لە ساڵی ١٩٧٣ ژیانی هاوسەری پێکدەهێنێ .

+ خاوەنی پێنج منداڵە ( سێ کوڕ و دوو کچ ) ، بە ناوەکانی ( هێمن ، بژار ، هەژار ، خوناو ، شنۆ ) .

+ لە ٢٥ / ٧ / ١٩٨٢ بۆتە پێشمەرگە لە ریزەکانی حزبی شیوعی تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ .

+ له پێشمەرگایەتی پلەی ( سەرپەل ) ی هەبووە لە بەتالیۆنی پێنجی هەولێر .

+ لەو چەند ساڵەی پێشمەرگایەتی بەشداری دەیان شەڕو داستانی کردووە .

+ لەبەر ئازایەتی و چاونەترسی و دڵسۆزی له ناوەڕاستی هەشتاکان بە یەکێك لەو دوانزە هاوڕێیە دەست نیشان کرا کە سەرپەرشتی کارە نهێنیەکانی ناوشاری هەولێریان پێسپێردرا بوو لە لایەن حزبی شیوعیەوە .

+ له دوای ڕاپەڕین ماوەیەك کرێکاری کردووە، پاشان لە ڕێکخراوی ( ئیکۆ ) و( ئێم . ئەی . جی ) کاری کردووە .

+ لە دوای نیوەی دووەمی نۆهەتەکان بۆتە بەرپرسی سەربازی ( پێشمەرگە ) کانی بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێری حزبی شیوعی کوردستان تا ساڵی ٢٠١٢ ، لەو ساڵەوەش تاکو بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبە له بەشی ئیداری و لیژنەی کۆمەڵایەتی بارەگای هەولێرە .

## پێشمەرگایەتی شاخ و خانەنشینانی شار

وەك زۆربـــەی پێشـــمەرگەكانی دیكـــەی كوردســـتان، بەشـــی خـــۆم برسـیەتیو سـاردو سـەرمای پـیرە قەنـدیلو چـیاكانیترم چەشـتووە! چـەندینجار ڕوو بـە ڕووی مـەرگ بومەتـەوە! ئـەو كاتـەو ئێسـتاش پەشـیمان نـیم لـەو خـەباتو تێكۆشـانەی ڕابـردووم، پێموایـە ئـەوە ئـەركێكی نیشـتیمانیو نەتەوایـەتی سەرشـانم بـووەو بـۆ پاداشـتو پیاهەڵدانیشم نەكردوە .

دوای ڕاپـەڕینو كۆتـایی هـاتنی شـەڕی نـاوخۆ بـە هـەوڵو هیمـەتی كۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەكانی هەموو لایەنەكان كار بۆ ئەوە كرا، كە پاداشتی ئەو ڕۆژە ناخۆشانەمان بدەنەوە!

تازە مووچەی خانەنشینیم لە سنووری ئیدارەی سلێمانی بۆ دەرچوو بوو، وەك مەرجێكی یاسایی دەبوایە ڕۆژانی مووچە دابەشكردن خودی پێشـمەرگە خانەنشـینكراوەكان خۆیـان بـۆ پەنجـەمۆرو وەرگـرتنی مووچەكانیان ئامادە بوونایە!

ئەم دوو ئیدارەییە وای كردبوو پێشمەرگە خانەنشینكراوەكانی ئـەم سنوورەو تەواوی شارو شارۆچكەكانی كوردستان روو لە سلێمانی بكـەن، ڕۆژانی مووچە وەرگرتن دەبووە گەڕەلاوژەیەك كەس كەسی نە بە ناوی خۆیو نە بە ناسناوی پێشمەرگایەتی نەدەناسییەوە!، لـەو قەرەباڵغیـە هـەر وات دەزانـی پێـنج شـەش كیـژۆڵەی جـوانو ناسـك بـە بـێ سـرە دەچوونە ژووری!

منیش خۆم پێ نەگیراو گوتمە پاسەوانەکە: ئەوە بۆچی هەر ئافرەتێك دێتو دەینێریە ژوورەوە؟

کاکەی پاسەوان وتی: خالۆ گیان ئەمانەش وەکو تۆ پێشمەرگەی دێرینن!

وتم: کەسی خارەی ئەدی لۆ ئێمە لەو چیاو چۆلە مردبوین لە برسانو لۆ پاروە شیوەکی گەرم، قورئان بە هەقت ئەگەر دانیشتوانی گوندەکان نەبوونایە دە ڕۆژ پێشمەرگایەتیمان پێ نەدەکرا! مادام ئەو هەمووە ژنە پێشمەرگەی دێرین بوون! لۆ ئەمە کۆرە ببووین لۆ ناو باوشی گەرمی ژنەك و گانەکی ئەگەر دەستی خۆمان نە بایە ئێستا هەموومان نەزۆك بووین!.

کە خارە خولە قسەکانی تەواو کرد، بە دەست خۆم نەبوو، پێکەنینم هاتیو وتم: خارە مەبەستت لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە چیبوو؟

وتی: هاوڕێ گیان من پەشیمان نیم لەو ڕۆژانە، بەلام کەی ڕەوای هەقە هەر بەرپرسەو ژنو کچی خۆی کردۆتە پێشمەرگەی دێرینو بەپلەی بەرز بەرزیش خانەنشینیان کردوون! زۆربەی جاشو کۆنە بەعسییەکانیش کراونەتە هاوسەنگەرمان! ئەوەیە دەڵێن کێ کردیو کێ خواردی!!

## گۆلکە سۆر

بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی حزبی مەفرەزەیەکی حەوت هەشت هاوڕێ هاتبوینە خوارەوە ، گەیشتینە گوندێکی ناوچەی (بەڕانەتی ) پیاوێک خۆی دابوە بەر تیشکی خۆرو قاچی لەسەرِ قاچی دانابوو ! پێدەچو هەم خەوی شەوی خۆش بووە لە باوەشی ژنی ! هەم نانێکی باش و گەرمی بەیانیشی خواردوە ! ڕانك و چۆغەلێکی کرو و کراشێکی پەڕۆینی لە پێ بوو بە جل و بەرگە خاوێنەکەیەوە دیار بوو کە ئاغا یان کێخوای گوندە ! کە گەیشتینە لای سلاوێکمان لێی کرد زۆر بە ساردی وەلامی داینەوە !

وتی : ئێوە پێشمەرگەن ؟

هاوڕێیەکمان وتی : بەلێ قوربان

پیاوەکە وتی : بۆچی ئێوە هەر لە ناو گوندەکان دەگەڕێن و دەسوڕێنەوە ! دەبڕۆن معسکەرێك بگرن ! کاکە وا دابنێ شەڕی معسکەرتان پێناکرێ ! دەبڕۆن ڕەبیەی سەر ئەو گردە بگرن ! بە دەست ئاماژەی بە بەرزاییەکدا

منیش خۆم پێ نەگیرا وتمە پیاوەکە وەرە وەرە کەسی خاری ، پیاوەکە لێمان نزیك بۆوە

وتم : مەلایەك هەبوو لە گوندەکی هەموو ڕۆژانی هەینی دوای نوێژ دەی وتە میوانانی مالی خوا فلانی کوڕی فلانی بە چاوی خۆم بینیم کوڕەکەت میزی لە ناو کانی کرد !

فلانی کوڕی فلانی بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو کوڕەکەت کوفری دەکرد!

فلانی كوڕی فلانی به چاوی خۆم بینیم كوڕەكەت كلكی كەرەكی بڕی !
ئـەم جۆرە قسـانەی مامۆسـتا وای كـرد باوكـەكان داركـاری كوڕەكانیـان بكـەن ، شـەوێكیان كـوڕانی داركـاری كـراو بـۆ بـێ دەنـگ كردنـی مـەلا ڕاوتەكبیریان كردو چوونە بن دیواری ماڵی مەلا سەرمەشقی لاوەكان بە دەنگێكی بڵند
وتی: كوڕینە ؟
ئەوانیش هەموو پێكەوە گوتیان: بەڵێ!
كوڕەی سەركردەیان وتی: ئەمشەو دەچینە ماڵی مەلا.
هاوڕێكانی وتیان: ئێمە ئامادەین، بەڵام بۆ چی؟
كوڕەی سەركردەیان وتی : ماڵی مەلا (گۆلكێكی سۆر) یـان هەیـە سـەری دەبـڕین و دەیكەینـە (قاورمـە) و دەیخـۆین ، مـەلاش دەكـوژین، هـەتا بەیانیش لەگەڵ مەلا ژنێ ڕادەبوێرین!
مەلاو مەلاژنیش لە ناو حەسارێ دانیشتبوون، مەلا كە گوێی لـە قسـەی گەنجەكان بوو، دەستی كرد بە كۆخە كۆخ بۆ ئەوەی بە گەنجەكان بڵـێ گوێم لە پیلانـەكەتان بوو!
مەلاژنیش ڕووی دەمی لە مامۆستا كرد وتی: ئەیەڕۆ پیاوەكە دەڵێی لـە قسەی ئەو منداڵانە دەترسێی؟!
مـەلاش وەڵامـی مـەلاژنی دایـەوە وتـی: وەڵا ژنـێ چیت لـێ بشارمەوە ئەوەی دەقەومێ لـە مـنو لـە گۆلكەسـۆری دەقـەومێ لـۆ تـوو چ عـەیبی نییە!
پیاوەی گوندنشین لە مەبەسـتی توانجەكـەم گەیشـت وتـی: یـانی منـت هێنایـە ڕێـز مـەلا ژنـی بـە تورڕەییـەوە ئێمـەی بەجێهێشـتو بـەرەو دیوەخانێ گەڕایەوە.

## ئەگەر بە شەو کەوتینە کەمینەوە

مەفرەزەیەکی پانزە هاوڕێی گەیشتینە (بەستی شەرغە) یادی بەخێر شەهید (کانەبی گچکە) بەرپرسی سیاسیو منیش بەرپرسی سەربازی ئەو مەفرەزەیە بووین، برسیەتیو ماندوویتی لە لایەكو هیلاکی خەو لە لایەکیتر هێزی لێ بڕیبووین، (گەندەرانێك)مان دۆزییەوە، وتمان با پشوویەك وەرگرین، تا خۆرئاوا، ئینجا بەرەو شوێنی مەبەست هەنگاو دەنێین!، ناوی هاوڕێیان نووسرا بۆ ئێشکگری، بەشێك لە هاوڕێیان خەوتن، بەشێکیشیان لە دەوری هاوڕێی شەهید (کانەبی گچکە) کۆبوونەوە، شەهید کانەبیش یادی بەخێر وەك بەرپرسی سیاسی مەفرەزەکە گیای بۆ هێنابوونە چۆکان، ئەوەندە بەتام باسی مۆسکۆو ئیشتراکییەتو رزگاریو ئازادی بۆ دەکردن هەر یەکێکیان بە خەیاڵ ببوون بە پاڵەوانێکی مێژووییو ڕزگارکەری مرۆڤایەتی!

وتم: هاوڕێیان من سەرخەوێ دەشکێنم، هاوڕێیانیش ناوە ناوە پرسیارێکیان لە شەهید کانەبی دەکرد ئەویش وەڵامێکی پێویستی دەدانەوە، یەکێ لە هاوڕێکان پرسیاری ئەوەی لێکردبوو، کە ئەگەر بەو شەوە بکەوینە کەمین چی بکەین؟

شەهید کانەبیش هەر بۆ گاڵتە وتبووی ئەو پرسیارە پەیوەندی بە (خارەخولە)وە هەیە ئەو بەرپرسی عەسکەریە بڕۆ لەو بپرسە، منیش لە شیرین خەو دابووم ئەو هاوڕێیەش گوتی: خارە خولە خارە خولە!!

منیش یەك پێ لە خەو ڕابوومو گوتم چیبووە هاوڕێ چوار دەورمان گیراوە؟
گوتی: نەخێر
وتم: کاتی پاسەوانیمە؟
هاوڕێکە: نەخێر
خارەخولە: ئێ باشە بۆچی لەو خەوە خۆشەت کردم؟
هاوڕێکە: وەڵلا پرسیارێکم هەیە، دەڵێم ئەگەر بەو شەوە بکەوینە کەمین چی بکەین؟
خارە خولە: وەڵلا ئەگەر دەست نەکەیەوە دایکەکەت دەگێن!
ئیتر بەو شەوە هاوڕێیان دایانە قاقای پێکەنین.

منیش وەکو ڕاهاتووم هەر دەبێ لەگەڵ قسەخۆشەکانی خارە خولەدا پێبکەنم، بۆیە زۆر پێکەنیم وەك پێکەنینی ئەو هاوڕێیانەی کە ڕەنگە لەو شەوە دەنگی پێکەنینیان وەك قاسپەی کەو دەنگی دابێتەوە.
وتم: خارە هەر بە ڕاست چەند جار کەوتوویتە کەمینی بەعسییەکانو جاشو مەفرەزە خاسە کوردەکانەوە؟
خارە وتی: ئەو شەوە نەکەوتینە کەمینەوە، بەڵام لەوەتەی کورد هەیە کەمینی بۆ یەکتر دادەنێنەوە!

## خولەو دکتۆریان نەوتووە

مەفرەزەیەکی دە پانزە هاوڕێی بووین، ئەوانەی دێتەوە یادم (شەهید مەلا عوسمان، شەهید شوان، شەهید پشتیوان، هەژار مێرگەسۆری، سەلاحەدین، ئەرکان، ..... هتد) گەیشتینە گۆڕستانی گوندی (دۆستانە) لە ناوچەی برادۆست، وتمان با پشوویەك وەرگرین، دیار بوو هاوولاتیەکی گوندەکە ئێمەی بینی بوو بەرەو لای ئێمە هات، کە گەیشتە لامان سلاوێکی کرد، ئێمەش سلاوەکەمان بە گەرمی لێ وەرگرتەوە.

پیاوەکە وتی: ئێوە پێشمەرگەن؟

هاوڕێیانیش وتیان: بەڵێ.

هاوولاتییەکە لە خۆشیان زەردەخەنەیەکی هاتێ !

وتی : بە قوربانتان بم دکتۆرتان لەگەڵە؟

ئاخر تەنها شتێك کە سوودبەخش بێت لە کاتی هاتنی پێشمەرگە بۆ دانیشتووانی گوندەکان کۆڵەپشتەکەی دکتۆرە ، کە چەند دەنکە حەبێکی تیایەو بەس ئەویتر بارگرانی بووە بۆ خەڵکی گوند!، ئەو کاتانەش بەشی زۆری مەفرەزەکان دکتۆر، یان یاریدەدەری پزیشك (معاون گبی) یان هاوڕێیەکی بەشدار لە خولێکی چەند ڕۆژەی فریاکەوتنی سەرەتاییمان لەگەڵ دەبوو .

هاوڕێیان وتیانە گوندنشینەکە: خێرە دکتۆرت بۆ چییە؟

پیاوەکە وتی: ئەوە سێ چوار ڕۆژە لە تاو ئازاری (گەدە) م نەخەوتوومە هەرچی دەیخۆم دەبێتە ئازارو ڕشانەوە!

یەکێ لە هاوڕێیانیش بە دەستی ئاماژەی بۆ من کرد

وتی: خارە خولە دکتۆری ئێمەیە!

گوندنشینەکە بە بێ سێو دوو گوتی: وەڵلا برام خولەو دکتۆریان نەوتووە!

وتم: کاکە بە ناوەکەم مشەوەش مەبە! بە ئامۆژگاریو چارەسەرەکەم تاقیم بکەوە!، ئەگەر جگەرەکێشی وازی لێبێنە! بۆ ماوەی مانگێك پارێزی بکە لە (سوێریو تیژیو ترشی)، تا بۆت دەکرێ ساوار و ژاژی مەخۆ)..

پیاوەکە قسەی پێ بڕیمو وتی : وەڵلا ژاژی دەخۆم ئەگەر پێی بشمرم!

منیش بە پێکەنینەوە وتم: دەبڕۆ بخۆ هەتا سەگ تۆپ دەبی.

ئیتر هاوڕێیان دایانە قاقای پێکەنینو بە گوند نشینەکەیان وت : کاکە ئێمە پارەی پشکنینی (عیادە) ی دکتۆریشمان ناوێ.

منیش پڕ بە دڵم پێکەنیم، وەك ئەوەی خۆم لەو کاتو ساتە لەگەڵیان پێکەنیبم، وتم: وەڵلا خارە ئامۆژگاریەکانت زانستیانەشە بۆ نەخۆشیی گەدە!

خارە وتی: هاوڕێ سامان ئەو کوردە تەنها بە ناو و ڕووخسار هەڵدەخەڵەتێن!، نەك بە ناوەڕۆك، ئەوە نییە میللەتو حزبەکانی دەسەڵاتیش بە ئامۆژگاریەکانی حزبەکەمان نازانن و پشگوێی دەخەن، تەنها لەبەر ئەوەی دەڵێین بەرژەوەندی خەڵك و نیشتیمان بخەنە پێش بەرژەوەندی خۆتان.

## حزبی شیوعی گەیشتیتە دەسەڵات

ساڵی ١٩٨٤ مەفرەزەیەکی دە پانزە هاوڕێی بووین، ئەوانەی دێتەوە یادم (شەهید سەفەر، شەهید عەباس، شەهید بڕیار، شەهید سەرباز، یادیان بەخێر، مستەفا، شێخە، کاروان مورتکەیی، کریم قادر سادق، کارزان حسێن نەبیو ..... هتد) ماندوو و برسی لە دەشتی قەراجێ بەرەو چیای قەرەچوغ سەرکەوتین، لە دۆڵێکی چیاکە دانیشتینو پشوویەکماندا، یادی بەخێر هاوڕێ شەهید (سەفەر) وتی: خارە خولە قسەیەکی خۆشمان بۆ بکە؟

منیش وتم: کوردستان ئازاد بووە، حزب بارەگای لە (بینایەی نەقابەی کرێکاران*)ە، خوا بەوێ ڕۆژێ نەکات حزب گەیشتیتە دەسەڵات! پێش ئەوەی حزب بگاتە حوکم لە مەجلیسێکی ئاسایی‌و لە کاتی گفتوگۆیەکی سیاسی (خدر) ناوێك تواناى وەڵامدانەوەى زمان لووسی‌و ڕاو سەرنجەکانی هاوڕێیەکمانی نابێت‌و هەرچی جوونی ناشرین هەیە بە حزبمان‌و هاوڕێکەمان دەدات! کە حزبیش گەیشتۆتە حوکم، هاوڕێکەمان بە دەرفەتی زانیوە مەفرەزەیەکی بردۆتە سەر ماڵی (خدر) و هەر لەوێ ڕا (خدر) یان داوەتە بەر شەق‌و جوون**و بردویانەتە شوێنی مەبەست، دایکی (خدر) بە منداڵانی ئاوایی هەواڵ دەنێرێت بۆ باوکی (خدر) کاتێك ئەم هەواڵە بە باوکی (خدر)ی ڕادەگەینن، بە پەلە دەگاتەوە ماڵەوە!

دایکی (خدر) بە گریانەوە دەڵێ: شیوعیەکان هاتن خدریان (مارکوژ) کردو لەگەڵ خۆیان بردیان!
دوو رۆژی پێچوو (خدر) هەر نەگەڕایەوەماڵەوە، باوکی خدر بیری دەکەوێتەوە کە لە قۆناغی پێشمەرگایەتی شاخو پارتیزانی پێشمەرگەیەکی شیوعی بە ناوی (خارە خولە) چەند جارێك رێی کەوتۆتە ماڵیان‌و دایکی (خدر)یش نانی گەرم‌و شیو***ی خۆشی بۆ ئامادە دەکردو جلەکانی دەشووشت، باوکی (خدر) بە دڵخۆشییەوە بانگ دەکات، کچێ ئافرەت.. دایکی (خدر) بە دلگرانییەوە دەڵێ: بەڵێ پیاوەکە.
باوکی (خدر) دەڵێ: ئافرەت لە بیرت ماوە کاتی خۆی مەسئولێکی شیوعی چەند جارێك هاتە ماڵمان، تۆش جلەکانت بۆ شووشت! دەزانی کامەیان دەڵێم: ئافرەت ئەو پێشمەرگەیەی کەرەبابە**** جینجرەکەت بۆ سەربڕی!
دایکی (خدر) لە ناو لێدانەکانی (خدر) دەڵێ: دەك بە قوزەلقورتی بێت، خۆزیا دەستم بشکایەو شیوم بۆ لێنەنابوایەو جلەکانیم نەشووشتبایە!
باوکی (خدر) دەڵێ: ئافرەت دلگران مەبە لە هەموو زەمانەکی پیاوی باش وخراپ هەر هەبووە، بڕۆ هەرچی هێلکەی مریشك‌و عەلەشیش‌و قازو مراوی هەیە بۆم لە سەبەتەیەك***** بکەو قازێکی نێرەی گەورەشم بۆ پەلبەست بکەو سبەی لەگەڵ مەلا بانگدانێ دەچمە شاری‌و خۆم دەگەیینمە (خارە خولە)ی.

بەیانی زوو باوکی (خدر) دەگاتە بەردەم بارەگای حزب و پرسیار لە پێشمەرگەکان دەکات، ناونیشانی ماڵی منیان بدەنێ؟

پێشمەرگەکانی بارەگا دەڵێن ئەوە یەکەم جارمانە گوێمان لەو ناوە بێت و نایناسین!

هەر لەو کاتە پێشمەرگەیەکی هاوسەنگەرم بۆ کارێکی خۆی بەو بەیانییە لەبەردەم بارەگایە ناونیشانی ماڵی من دەداتە باوکی (خدر).

هێشتا نانو چای بەیانیمان نەخواردووە، لە دەرگا دەدرێت منیش بۆ ئەوەی قەرە بووی چەند ساڵەی جێهێشتنو پێشمەرگایەتی دایکی منداڵەکانم بکەمەوە دەڵێم: ئافرەت دانیشە خۆم دەرگاکە دەکەمەوە، دەگەمە نزیك دەرگا دەنگ هەڵدەبڕم: ئەوە کێیە لە دەرگا دەدات؟

دەنگێکی پیاوانە وتی: خارە خولە خۆمانین!

کە دەرگا دەکەمەوە پیاوێکی پیر لە پێش دەرگا ڕاوەستاوە، بەر دەرگا یەك پارچە هێلکەی شکاوە! سەیرێکی پیاوەکە دەکەم، قازێکی مردارەوەبووی بە دەستەوەیە!

دوای چاکوچۆنی هێلکە شکاوەکانی ناو سەبەتەکەو قازە مردار بووەکەم خستە ناو تەنەکەی زبڵ، فەرموو فەرمووی ژوورەوەم لێکردو چووینە ژوورەوە!.

پیاوەکە وتی: کاکە بە شێتم تێمەگە کە گەیشتمە ئاست دەرگاکەتان بۆ ئەوەی لە دەرگا بدەم سەبەتەی هێلکەکە بە دەستمەوە بوو بە دەمم گرتمو لە دەرگای ماڵتانمدا، هێشتا دەستم بۆ سەبەتەکەی دەمم نەبردبوو، تۆ وتت کێیە؟ منیش کە وەڵامم دایەوە هێلکەکان کەوتنو شکان!

وتم بەیانی زووە با قازەکە (قیڕەقیڕ******) نەکاتو منداڵی گەڕەکمان لێ کۆ نەکاتەوە، توند ملیم گرتبوو، بەڵام دیارە قسمەت نەبووە، ئەویش بۆ خۆی مردارەوە بوو!

منیش بە پێکەنینەوە دەڵێم: دەی دەی مام حاجی بە قوربانی منداڵەکانمان بێت، بەڵام ئەگەر ئەمجارەیان ڕێت بە ماڵی ئێمە کەوتەوە بە پێلەقە لە دەرگا بدەو هەردوو باڵی قازەکەش بگرە، با ئەویش بۆ خۆی هەر هۆڕنی هەوایی لێبدات!

دوای نانو ماست خواردن باوکی (خدر) خۆی بە من دەناسێنی کە خەڵکی فلانە گوندەو چەند جارێك لە کاتی پێشمەرگایەتی خزمەتمیان کردووم، دووبارە بە گەرمی بەخێر هاتنی دەکەم ، دەڵێم ئەدی (براژنم دایکی منداڵەکانت) چۆنە؟

باوکی (خدر) یش لە شوێنی جوونو دوعاکانی پێشووی دەڵێ: وەڵڵا سڵاوێکی تایبەتی بۆت هەبوو، گوتی : ئەتوو ئەمجارەیان بڕۆ جارێکیتر وێکڕا دەچینە ماڵی (خارە خولە)، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت بۆ کارێك هاتومەتە لات، مەبەستی هاتنەکەی بۆ لای من ڕوون دەکاتەوە، کە چەند ڕۆژێکە هاوڕێیان (خدر)ی کوڕیان گرتووەو ئەویش تەنها من شك دەبینێ بۆ ئەوەی خدری کوڕی بەردەم! هێشتا من وەڵامم نەدابۆوە دایکی منداڵەکانم وتی: پیاوەکە لەگەڵی بڕۆ.. بڕۆ ئەتوو هەموو عومری خۆت بە پێشمەرگایەتی پێشکەشی ئەو حزبە کرد، خۆ قاتی ئەوانیش ڕێزت دەگرنو بە قسەی تۆ ئەو کوڕە ئازاد دەکەن!

منیش کە گوێبیستی ئەو هەواڵە ناخۆشە دەبم دەڵێمە باوکی (خدر) ئەوەی ڕاستی بێت ئەو هاوڕێیانەی کاتی خۆی بەیەکەوە لە شاخ بوین،

یادیان به‌خێر هه‌ندێکیان شه‌هید بوون، هه‌ندێکیشیان کۆچی دواییان کردووه، ئه‌وه‌ی ماوه‌ته‌وه‌ش توانای به‌رپرسیارێتی نییه! به‌لام کێشه‌یه‌ك نییه هه‌ڵسه با بچینه بارەگای حزب، له‌گه‌ڵ باوکی (خدر) گه‌یشتینه (پرسگه‌ی باره‌گا) هاوڕێیه‌کی سمێڵ تراشرای دانیشتووه، ئێمه‌ش سلاوێکی گه‌رممان کرد، هاوڕێی پرسگه‌ش هه‌ر به سه‌ری لموزی وه‌لام ده‌داته‌وه!

وتم: هاوڕێ گیان هاتووینه‌ته لای به‌رپرسی حزب، هاوڕێکه‌ی پرسگه ده‌ڵێ: کۆبوونه‌وه‌یان هه‌یه!، دوای نیو کاتژمێر هه‌م دیسان وتمه هاوڕێی پرسگه هاوڕێ گیان ئه‌م مام حاجییه مه‌به‌ستم باوکی (خدره) له گوندی هاتییه‌و بۆ گوندیش ده‌گه‌ڕێته‌وه پێنج خوله‌ك ده‌مانه‌وێت چاومان به به‌رپرسی حزب بکه‌وێت..!!

هاوڕێکه‌ی پرسگه به توڕەییه‌وه ده‌ڵێ: خاره ئه‌تو ده‌ڵێی تێناگه‌ی حزب کۆبوونه‌وه‌ی هه‌یه کۆبونه‌وه!

ناچار داده‌نیشمه‌وه! بوو به کاتژمێرێك هه‌م دیسان وتم: هاوڕێ بڕۆ به مه‌سئوله‌که‌ی حزب بڵێ (خاره خوله) هاتووه پێنج ده‌قیقه‌یه‌ك کارم پێیه‌تی!

هاوڕێی پرسگه وه‌لامی نه‌دامه‌وه‌و پشتگوێی خستم ! ناچار منیش به بێ مۆڵه‌تی هاوڕێی پرسگه به‌ره‌و ژووره‌وه چووم!

هاوڕێی پرسگه به توڕەییه‌وه قۆڵی گرتم‌و منی هێنایه‌وه پرسگه!

لێمان بوو به ده‌نگه ده‌نگ‌و قسه‌یه‌ك له من‌و قسه‌یه‌ك له‌وی نه‌گه‌یشتینه یه‌ك‌و به مستان وه‌رگه‌ڕا ینه یێك، باش بوو باوکی (خدر)ی که‌وته نێوانمان ئه‌گه‌رنا هاوڕێکه‌ی پرسگه سێ چوار په‌راسوی

ده‌شكاندم!، به دڵساردی باره‌گای حزبمان به‌جێهێشت‌و به باوكی (خدر)م وت: چی بكه‌ین حزب كه‌وتۆته ده‌ست ئه‌و ده‌م ڕووتانه!
باوكی (خدر) ده‌گه‌ڕێته‌وه گوندی منیش ده‌چمه‌وه ماڵه‌وه دایكی منداڵه‌كان ده‌ڵێ: ها (خوله) چیتكرد، پیاوه‌كه‌ت ئازاد كرد؟
منیش ده‌ڵێم كچێ بڕۆ هه‌ی كه‌ر دایكی كابراو حزب بگێ! له‌گه‌ڵ هاوڕێكه‌ی پرسگه لێمان بوو به شه‌ڕ، مام حاجی نه‌بوایه ئێستا له نه‌خۆشخانه بووم!
دایكی منداڵه‌كانم ده‌ڵێ: خۆزگه له جیاتی پاداشتی پێشمه‌رگایه‌تیه‌كه‌شت، دوو سێ په‌راسووتیان بشكاندایایه‌و ڕه‌وانه‌ی لای ( خدر ) یان بكردایای..!
له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زۆر به وردی گوێم بۆ قسه‌كانی ڕاگرتبوو، گوتم: وه‌ڵا خاره پێشبینیه‌كه‌ت هاته‌دی كوردستان ئازاد بوو، حزب باره‌گای له نه‌قابه‌ی كرێكاران كردووه !
خاره خوله به پیكه‌نینه‌وه گوتی: هاوڕێ سامان شه‌ڕه‌كه‌ی پرسگه‌ش ڕوویدا له ساڵی ١٩٩٣ ئه‌و هاوڕێ (فه‌رهاد ئه‌كره‌م)ـه نه‌یده‌هێشت له پرسگه بڕۆمه ژووره‌وه ده‌یگوت: هاوڕێیان كۆبوونه‌وه‌یان هه‌یه!! .

* بینایه‌ی نه‌قابه‌ی كرێكاران : ته‌لاری سه‌ندیكای كرێكاران
** جوون : جنێو
*** شیو : چێشت
**** كه‌رمباب : كه‌ڵه‌شێر
***** سه‌به‌ته: زه‌مبیله
****** قیره قیڕ : ده‌نگی قاز

## چوار شەممەی سەر چاکێ

لە نیوەی یەکەمی ساڵی هەشتاکان مەفرەزەیەکی دە پانزە هاوڕێ بووین گەیشتینە گوندی (نۆغەران)ی سەر بە ناحیەی گوێڕی دەشتی هەولێر، دوای نیوەڕۆ دوو ئۆتۆمبیل بەرەو گوندەکە دەهاتن، یەکێ لە دانیشتوانی گوند وتی: ئەو دوو ئۆتۆمبیلەو ئۆتۆمبیلیتریش زۆربەی چوار شەموان دێنە سەر مەزاری (سەید عەولا) بۆ مرازو مەخسوودان، هاوڕێیانیش منو سێ هاوڕێیتریان ڕاسپارد، کە دوای ئەوەی دڵنیا دەبینەوە ئەو کەسانە پیاوی ڕژێم نین، تا دوای خۆرئاوابوون ڕێگایان نەدەین بەرەو شار بگەڕێنەوە!، من و ئەو سێ هاوڕێیەش یادیان بەخێر هاوڕێیەکیان شەهید بوو، یەکیان کۆچی دوایی کردووە، ئەوتریشان لە دەرەوەی کوردستانە، چووینە سەر ئەو ڕێگایەی بەرەو گۆڕستانی(سەید عەولا)ی نۆغەرانێ دەچوو، کاتێك هەردوو ئۆتۆمبیل گەیشتنە لامان سڵاویان کرد، هاوڕێیانیش سڵاویان وەرگرتەوە، سەیری ئۆتۆمبیلەکانیان کرد، هەر ئۆتۆمبیلەو دوو ژنو دوو پیاوی تیایە!، هاوڕێیان پێیان وتن: ئێوە بۆچی هاتوونەتە ئەو ناوە؟
ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: چوار شەممە ڕۆژی مرازو مەخسوودانە، ئێمەش هاتووینەتە سەر مەرقەدی (سەید عەولا)ی نۆغەرانێ، دوای ئەوەی هاوڕێیان خۆیانو ئۆتۆمبیلەکانیان ڕۆنی هاوڕێیەکمان وتی: خارە چی بکەین  لەو کاتە یەکێ لە پیاوەکان بە زمانی هەولێری وتی: کورە خولە ئەوە ئەتووی؟

که سەیری پیاوەکەم کرد نەمناسییەوە!
وتی: کورە خولە ئەوە نامناسییەوە، ئەمن عومەرم عومەر!، ئەدی بە یەکەوە کرێکاریمان نەدەکرد لە سەری ڕەش!.
ئیتر باوەشمان پێکدا کردو وتم: ڕێگایان بدەن با بچنە سەر مەرقەد، هەردوو ئۆتۆمبیلەکە بەرەو سەر گڵکۆی چاکەکە چوون، من و عومەرو هاوڕێیان خەریکی هەواڵ پرسینی ناو شار بووین، پاشان بە عومەرم وت: بڕیار وایە تا درەنگانێ نەچنەوە بۆ شار!
عومەر سوێندێکی گەورەی خوارد کە نابێت بڕۆین تا نانیان لەگەڵ نەخۆین!، وتی: خولە گۆشتێکی زۆری گۆلکمان هێناوە!
لەبەر خاتری سوێندەکەی عومەرو برسیەتیو بۆن و بەرامەی ئافرەت، پێش وەڵامدانەوەی من سێ هاوڕێکەیتر بە بێ دوو دڵی وتیانەعومەر: فەرموو تۆ پێشکەوە ئێمە بە دواوەتەوەین .
کە گەیشتینە لای هاوڕێکانی عومەر بەیەکەوە دانیشتین، ئیتر سفرە ڕاخراو میوەو تێکەڵە داندراو ئافرەتەکان خەریکی شیش لێدانی گۆشت بوون، لە هەڵسوکەوتەکانیان دیار بوو، کە هەر چوار ژنەکە خێزانی ئەو پیاوانە نەبوون، یادی بەخێر هاوڕێ شەهیدەکەمان وتی: خارە هەرچەند تەماشا دەکەم ئەو ئافرەتانە لەشفرۆشن لەو قسانە بووین عومەر راستیەکەی درکاند!
وتی: دەتوانن لەگەڵیان ڕابوێرن، ئیتر ما هاوڕێیان لە من بپارێنەوە، کە ئەو ڕووداوە لە حزب بشارمەوە، منیش بەڵێنم پێدان، ئیتر هەر هاوڕێیەك ئافرەتێکیانی بردە لایەك منو عومەرو سێ هاوڕێکەی عومەرو ئافرەتێك مابووینەوە عومەر زۆر داوای لە من کرد کە منیش

لەگەڵ ئەویتریان ڕابوێرم! بەڵام ڕازی نەبووم وتم: من خاوەن ژنو منداڵم، وەك ئەو دەم رووتانە نیمو کاری وا لە من ناوەشێتەوە، ئیتر عومەر شیش بە شیشی تکەی بۆ دەهێنامو دەی وت: خولە بخۆ گۆش گۆلەیە!
دوای ئەوەی پێشمەرگەکان کاری خۆیان تەواو کرد، گەڕانەوە لای ئێمە، یەکێ لە پێشمەرگەکان هەر دەرشایەوە منیش بە پێکەنینەوە پێموت: کورە هەی سەیە، چی رویداوە ئەوانە مەشروبیان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە ئەی بۆچی دەرشێیەوە؟
هاورێکەمان بۆ خۆی لە کاتی قسەکردن زمانی تەتڵەی دەکرد، یادی بەخێر کۆچی دوایی کردووە، وتی ئاخر خارە ئەوە یەکەم جارمە ئەو ئیشانە دەکەم! ئیتر بوو بە پێکەنین، پێش ئەوەی عومەرو هاورێکانی بەجێبهێڵین، عومەر رانکوچۆغەڵێکی (تیلکۆی) لەبەر بوو، چوو دایکەندو دای بە من، وتی: خولە دوو رۆژە بە حەفتا دینار بە رادانم داوە، پیرۆزی تۆ بێت، بیکە بەرت!، ئیتر ماڵئاواییمان لێکردنو بەزمی هاورێکەی ڕشانەوە بوو بە بزەی سەر لێوانمان!، دوای دوو رۆژ لە چالاکییەکی دروشم نووسینی سەر دیوار پەمپی سبوغەکە تەقیو رانکوچۆغەڵە (تیلکۆیە)کەم کەلکی لەبەرکردنی نەماو کەونە رانکوچۆغەڵێکی پڕ لە ئەسپێی هاوڕێیەکم وەرگرتو نوێیەکەم فڕێدا.

من گەواهی ئەوە دەدەم خارە خولە چەند جارێك ئەم بەسەرهاتەی لە بەردەمی منو هاورێ کۆچکردووەکەو هاورێکەی دەرەوەی وڵات گێڕاوەتەوە، هەر جارێکیش من خارە خولەو ئەو دوو هاوڕێیەم

به‌یه‌كه‌وه ببینیبایه ده‌موت: خاره خوله كاتی گێڕانه‌وه‌ی به‌زمی سه‌ید عه‌ولآیه! هه‌ر دوو هاوڕێكه‌ش ده‌یانوت: هاوڕێ سامان خاره خوله له ئێمه كۆردارتر بوو، به‌س له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌رپرسمان بوو، له ئێمه‌ش به‌ته‌مه‌نتر بوو، ژن و منداڵیشی هه‌بوو شه‌رمی ده‌كرد.

## خەباتی پیشمەرگایەتی و ئەفلام کارتۆنی کوردی

دوای شەڕی کوێت هاوپەیمانەکانی ئەوسا ئابلۆقەی ئابووریان بەسەر ڕژێمی دکتاتۆری بەعسدا سەپاند، کەچی هاوولاتیانی عێراق زەرەرمەندی یەکەم بوون

دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ی کۆچڕەوە مەزنەکەو پاراستنی کوردستان لە لایەن هاوپەیمانانەوە، ڕژێمی عێراقیش ئابلۆقەی ئابووری خستبووە سەر کوردستان

لە ناوخۆی کوردستانیش دوو ساڵێك بوو حکومەتی فیفتی بە فیفتی پێکهاتبوو! سەرباری کەمی ئەزموونی حوکمڕانیو خۆ بەڕێوەبردن ، براکان لە لێواری شەڕی نێوخۆ وەستابوون .

تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٦ ڕۆژگارێکی ئێجگار زەحمەت بوو، کیلۆی شەکر تا سەد دیناری سویسری چوو بوو! فەردەی ئاردی گەیشتە (پێنج سەد دینار) فەردەی پەنجا کیلۆیی (جۆ)ش گەیشتە (دوو سەد) دینار لەبەرئەوەی هەژارەکان بە تەنها، یان لەگەڵ ئارد تێکەڵیان دەکرد بۆ خواردن!

ڕاوڕووتیو برسیەتیو (کەمی دراوی سویسریو کێشەی دراوە کۆپیەکەی ژێر دەسەلاتی بەعس) سەری لە هەموو هەژارێك، نەك دەوڵەمەندەکان شێواند بوو!

باری دارایی منیش زۆر خراپ بوو، کۆشێك منداڵی بچووکم هەبوو، نەك هەر بە نان و سك!

کورد وتەنی بە هیچ ڕانەدەگەیشتم! سەرباری هەموو خەمان لە خانووەکی (کرێ) ش دابووم، یەك دوو ڕۆژ پێش کۆتایی کاتی کرێی مانگی پێشوومان خاوەن خانوو دەگەیشتە بەردەم دەرگاو دەیوت: کاکە ئەگەر کرێت پێنادرێت چۆلی کەن سەد کەس مەمنونمە!.

ئەو ژیانە زەحمەتە وای لە دایکی منداڵەکانم کردبوو هەموو خەمەکانی بە مندا هەڵبڕێژێ!

دەیوت: پیاوی خەڵکی یەك ڕۆژ پێشمەرگایەتی نەکرد، لۆ خۆی کاسبی کرد ، بوو بە خاوەن خانوو!، لۆ خۆی کاسبی کردوو پارەی هیشکەی کۆکردەوە! خەڵك جاشایەتی کردو ئێستا لە هیچی کەم نییە!

ئەتووش بە دوای کڵاوی بابردوو کەوتی بە خۆت و بە حزبەکەت دینارێکتان لە گیرفانیدا نییە!، بەس بە من بڵێ ئەتوو ئەوەندە ساڵە سینگت دا بەر گوللان لۆ کوردستان چیت قازانج کرد؟!

دەمزانی قسەکانی دایکی منداڵان ڕاستەو لە تاو برسیەتی و نانی زگە!

بۆ پێکەنین وتم: کچێ ئافرەت هەی خودا بتگرێ، ئەگەر لەبەر من و حزب نەبوایە بە خۆت و منداڵەکانت لە ژیانتدا سەیری ئەفلام کارتۆنی کوردیت نەدەکرد!

منیش بە وەڵامەکەی زۆر پێکەنیم وتم: باشە خارە چۆن لەو کاتە ئەو قسەیەت بۆ هات؟

خارە وتی: منداڵەكان سەیری ئەفلام كارتۆنی دۆبلاژكراوی كوردیان دەكرد زۆر دڵخۆش بوون !

دایكی منداڵانیش بە قسان هەر ئەمنی دەكوتی!

وتم: باشە خارە ئێستا زیاتر لە بیست ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژە زەحمەتیانەدا تێپەڕیوە چ جیاوازیەك هەیە ؟!

خارە وتی: هاوڕێ سامان لۆمە هەر بە (ڕوبەی تەفتەفێیە)و لۆ خەركیش بوویتە هۆتێلی هەوربڕی پێنج ئەستێرەو ڤێلاو كۆمپانیای دەولیو بیرە نەوت!!.

## کۆبونەوەی حزبی و ترسی بەعسیەکان

دوای بەیانی باش وتم: خارە ئەمڕۆ دوو چنگە فستقم بدەرێ، ئەوە نییە هەفتانە لە فەیسبوك دەتخەمەوە بیری هاوڕێیان!!
وتی: کورە خەمم ئەوە نییە بەو ئاخیرەی عومرم لەسەر ئەو قسانە بە گرتنم دەدەیت ! خەمم ئەوەش نییە لە زیندانێ دەمخەنە ژووری چەقۆکێش‌و دەست‌و پشت کوترایان! خەمم ئەوەیە بە کەس بەرنابم‌و کەسیش نایەتە سەردانیم!
منیش دامە قاقای پێکەنین وتم : خارە خەمت نەبێت ئەگەر لەسەر ئەو توانجانە بتگرن ئەوە دڵنیابە پێش ئێوە من پەلبەست دەکەن، خارە خولە پێش ئەوەی تۆ چەند بەسەرهاتێکم بۆ بگێڕیتەوە با من یادو بیرەوەریەکانی خۆمت بیرخەمەوە، لە سەرەتاکانی ساڵی ۱۹۹۹ هاوڕێ (مەلا حەسەن*) وەك بەرپرسی رێکخستنی ناوەندی‌و ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کوردستان ئامادەی کۆبونەوەیەکی لیژنەی رێکخستنی قەزای ناوەندی هەولێر بوو، ئەو کاتە( من – سامان ) ئەندامی قەزاو مەکتەبی قەزاکە بووم، ئەندامانی قەزاکە پێکهاتبوون لەم هاوڕێیانە: (مامۆستا مەغدید حاجی، بەرپرسی رێکخستنەکە بوو، مام رەحمان سەرخوری، مام سەلیم شێمحەمەد، شێخ لەتیف، شێخە، دڵنیا، حاجی جەمال، دکتۆ ئازاد، سەرکار ئەنوەر، حاجی ئەکرەم، .......).

لەبەر پێشهاتە سیاسییەکانو رۆشنایی خستنە سەر رێکخستنو کاروباری لیژنەکانی سنوری کاری ئەم رێکخستنە کۆبوونەوەکە درێژەی کێشاو کوردەواری وتەنی: (قسە.. قسەی راکێشا)و کات بەرەو درەنگانێکی شەو رۆیی!، هاورێیانیش ئارەزووی چا خواردنەومیەکیان هەبوو، بەو پێیەی من لە هەموویان بچوکتر بوومو لە هەمان کاتیشدا کارمەندی رادیۆی ئازادی بووم، بارەگای رادیۆکەش هەر لە نێو بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێر بوو، چوومە بەشی پێشمەرگەکان، ئەو شەوەش هاورێ (خارە خولە) وەك بەرپرسی پێشمەرگەکانی بارەگا ئامادە بوو، بە ناوی هاورێیان داوام لێکرد ئەگەر دەتوانرێت یەکێ لە پێشمەرگەکان چایەکی پێشمەرگانەمان بۆ ئامادە بکات، خارە خولەش یەکێ لە پێشمەرگەکانی راسپارد، کەمتر لە بیست دەقیقە سینییەکی پڕ لە گلاسو کوپی رەنگاو رەنگو چایەستێکی گەورەی رەشو دوکەلاویو چایەکی یەك رەنگمان بۆ هاتەژووری کۆبوونەوە!، هەر چەندە ژمارەی کووپو پەرداخەکان لە ژمارەی ئەندامان کەمترو تەنها دوو کەوچکی چاشی لەگەڵ بوو، بەلام چایەکە بۆ جگەرەکێشو چاخۆرەکان هێورکردنەوەی مێشك بوو، هەر لەگەڵ چاخواردنەوەکەش بەردەوام بووین لە گفتوگۆ، کات بوو بە دەی شەو لە ژووری کۆبونەوەکە هاتینە دەرەوە، هاورێ (خارە خولە) لە نزیك بەرادی ئاوخواردنەوەکە دانیشتبوو، کە چاوی بە هاورێ مەلاو هاورێیان کەوت، یەکراست هەڵسایەوە، هاورێ مەلاش وەك نەریتی هەمیشەیی بە شێنەیی وتی: هاورێ خولە کوی؟

خارە خولەش وتی: وەڵڵا ماموستا حزب لە ئینزاردا بێت دەبی کووبم؟!

هاورێ مەلا بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: ئینزاری چی خولە؟
خارە خولەش ئاگاداری ئەوە بوو کە کۆبوونەوەکە زۆری خایاند، بە توانجەوە وتی: هاورێ لەوەتەی ئێوە لە کۆبوونەوەدان حزبی بەعس لە دەرئەنجامی ئەو کۆبونەوەیە دەترسێ!، بۆیە فەوجێکی سەربازیو دوو ڕەبیەی لە زێگای قوشتەپە زیاد کردووە!
هاورێ مەلا حەسەن بە پێکەنینێکی نەرمەوە وتی: چیە خولە دەرێی باوەڕت بە حزب لاواز بووە؟!
ئیتر هەموو هاورێیان دایانە قاقای پێکەنینو خارە خولەش یەك دوو سەرگوزەشتەیتری خۆشی بۆ گێڕاینەوە.

* مەلا حەسەن: ناوی ڕاستەقینەی (فەتاح تۆفیق فەتاح)ـە، ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کوردستان بوو.

## پێشمەرگەیەکی عاشق

سالّی دوو هەزار دەنگۆی ئەوە هەبوو کە شانە نووستوەکانی حزبی بەعس لە هەولێر لە جوولەدان، بۆیە کۆمیتەی پارێزگای هەولێری حزبی شیوعی کوردستان بڕیاری ئەوەی دا شەوانە جگە لە بەرپرسی عەسکەری بەرپرسێکی سیاسیش وەك ئێشکگر لە بارەگا بخەون، ئەو بڕیارەش تەنها ئەندامانی کۆمیتەی پارێزگاو قەزای ناوەندی گرتەوە، ئەو کاتەش من ئەندامی مەکتەبی قەزای ناوەند بووم، هاوڕێیان خارە خولەو مستەفا یادی بەخێر بەرپرسی سەربازی بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێرێ بوون، شەوێکیان خەفەریاتەکەی منو خارە خولە بە یەکەوە بوو، منیش نزیکەی دوو کاتژمێر خەریکی خوێندنەوە بووم، پشوویەکم وەرگرتو چوومە بەشی سەربازی، کە ژوورەکەی خارە خولەم کردەوە، بینیم خارە خولە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك دانیشتوونو پێدەکەنین..!

وتم: خارە دیسان چ بەزمێکت گێڕاوەتەوە با ئێمەش پێبکەنین؟

خارە خولە بە پێکەنینەوە وتی: هاوڕێ سامان تازە کێشەیەکی گەورە بەرۆکی حزبی گرتبوو!

منیش دەمزانی قسەکانی خارە خولە هەموو بۆ خۆشییە، وتم: ئەدی ئەمنو توو ئەمشەو حزب نینە لێرە، بۆ بانگی منت نەکرد؟!

خارە خولە بە پێکەنینەوە وتی: باش بوو پێویستی بە بڕیاری سیاسی نەبوو، زوو چارەسەرم کرد!

وتم: کێشەکە چی بوو؟

خارە خولە وتی: ماوەی هەفتەیەك دەبێت پێشمەرگەیەکی تازەمان وەرگرتووە، هاوڕێ (ئامانج)ی پێشمەرگەش هاتە لام وتی: خارە لە دوێنێوە ئەو پێشمەرگە تازەیە جەمەنانێکی بە پێی پێویست نەخواردووە ! دوورە پەرێزی هاوڕێیانەو زۆر بێزار دیارەو جگەرە بە جگەرە وەدەنێ، دەترسم بە شەو یان بە رۆژ تووشی بەڵایەکمان بکات وا باشە بانگی بکەیت ؟

پێشمەرگەکەم بانگی ژوورەوەم کرد، خۆم و دوو سێ پێشمەرگەیتر لە گەڵی دانیشتین وتم: هاوڕێ گیان هاوڕێیان دەڵێن بێزار دیاری، خێرە خۆ هیچ نەبووە؟

وتی: نەخێر هیچ نییە!

وتم: هاوڕێ گیان ئەگەر غەریبی دایکت دەکەیت بڕۆوە ماڵەوە، بەیانی دوای نیوەڕۆ وەرەوە..!!

وتی: نا.. غەریبی ماڵەوە ناکەم.

وتم: هاوڕێ گیان ئەگەر برسیتەو نانی ئێرەت بە دڵ نییە بڕۆ بازاری ئیسکان لەفە بخۆو وەرەوە؟

وتی: هاوڕێ گیان هیچ برسیم نییەو نانی ئێرەش خراپ نییە!

وتم: هاوڕێ گیان ئەگەر زگت، یان شوێنێکت دێشێ، با بتبەنە نەخۆشخانە؟

وتی: زۆر باشم‌و هیچ کوێیەکم نایێشێ!

وتم: هاوڕێ گیان ئەگەر شان‌و ملت رەق بووە، با هاوڕێیان بە روونی چەورت بکەن؟

وتی: نا هیچ جێیەکم رەق نەبووە!
وتم: هاوڕێ گیان ئەتوو بەو هەموو پرسیارو داواکارییە نەهاتییە ڕایێ، بەس ئەوە ماوە بڵێم بە هەموومان بتگێین؟ ئیتر هاوڕێکە شین و مۆر بۆوەو دایە قاقای پێکەنین !

بەو درەنگانی شەوە ئەوەندە پێکەنیم پێشمەرگەی ژوورەکانی تر بە دەم پێکەنینەکەمەوە هاتن وتم : باشە خارە دەردەکەی چی بوو؟
خارە خولە وتی: هاوڕێ سامان پێی لە دەردەکەی نا، ئەو سەیە عاشقەو چەند رۆژە لێرە بەستراوەتەوەو دەرفەتی ئەوەی نەبووە خۆڕی خۆڕی بە بەر دەرگای ماڵی کچەکەدا بڕوات!!.

## با ئێمەش خۆڕییەکمان هەبێت

ماوەیەکی کەم دوای ٣١ی ئابی ١٩٩٦و گەرمەی شەڕی نێوخۆ بوو، دەوروبەری عەسر بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری حزبی هاتمە بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێر، ئەو کاتە بارەگا لە نێو تەلاری (سەندیکای کرێکاران- نقابەی عمال) بوو، شێوە ئەندازەییەکەی ئەو بینایە ئاوا دروستکرابوو، لە شەقام بەرزتر بوو و بە چەند پەیژەیەك سەردەکەوتی، ئینجا دەگەیشتیتە دەرگاکە منیش کە گەیشتمە پێش بارەگا بینیم هاوڕێ (مام تەلعەت قەساب) یادی بەخێر لەو بەرزاییەوە وەستاوە، دوای ئەوەی بە قالدرمەکان سەرکەوتم و گەیشتمە لای سلاو و تەوقەم لەگەڵ کرد ، هاوڕێ (مام تەلعەت) زۆر بە دلگرانی وەلامی دامەوەو بە زمانە هەولێرییە شیرینەکەی خۆی وتی: (هاوڕێ بڕۆنێ بڕۆنێ) بە دەستیش ئاماژەی بۆ لایەکی بارەگاکە کردو وتی: تەماشای ئەو (خۆڕ ییە) بکە لە بن دارەکەی ! منیش کە سەیرم کرد بینیم هاوڕێیەکی پێشمەرگەی بارەگاکەمان لەگەڵ کچێك لە ژێر سێبەری دارەکە خەریکی گفتوگۆیەو نێوانیشیان مەترێکە! ئەو لا تەنیشتەی بارەگاو ئەو شوێنەی ئەوان لێی دانیشتبوون دەکەوتە تەنیشت شارەوانی، واتە شوێنێکی پەناو شاراوە نییە، منیش کە سەیری دیمەنەکەم کرد، وتم: هاوڕێ ئاساییە دوو هاوڕێنە بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەن! هەر لەو کاتەش هاوڕێ خارە خولە کە بەرپرسی سەربازی بارەگاو پێشمەرگەکان بوو لە ژوورەوەی بارەگا هاتە لای ئێمە، (مام

تەلعەت) لە دڵسۆزی خۆی بۆ ئەوەی حزب لەکەدار نەبێت، وتییە خارە خولە (وەرە تەماشای خۆڕییەکەت بکە)!!، خارە خولەش کە سەیری هاوڕێکەمانی کرد بە زەردە خەنەییێکەوە وتی: حزبەکانیتر سەدان جاش و ئەمن و ئیستیخباراتیان وەرگرتییە!، دەیان چەقۆکێش و حەبخۆریان هەیە!، سێ چوار ساڵە شەڕی نێوخۆ دەکەن!، دە لێیگەڕێن با ئێمەش خۆڕییەکمان هەبێت، حزب بە خۆڕییەکی لەکەدار نابێت ! ئیتر بوو بە پێکەنین.

* (بە سوپاسەوە ئەم بەسەرهاتەم لەسەر زاری هاوڕێ نەوزاد موهەندس) وەرگرتووە.

## بەزمی خولەی گچکەو خارە خولە*

لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٨٧ ئۆردوگـا زۆرەملێکـان جێگیربـوونو ببوونـە شـوێنی زۆربـەی خـەڵکی گونـدەکان، کـە دۆسـتو خانـەخوێی پێشمەرگەبوون، بـەردەوام هاموشـۆو مانـەوەی پێشـمەرگەو کەسـوکاری پێشمەرگەو یەکتر بینینو سـەردانەکان لـە ئۆردوگاکـان ئـەنجام دەدران، وای لێهاتبوو زۆرجـاران خێزانـی پێشـمەرگە لەگـەڵ پیاوەکانیـان تـاکو بەرەبەیان لە ماڵە خزمو دۆست، ژوورێکیان بۆ چۆڵ دەکـراو بەیەکـەوە دەمانـەوە، دوای بەسـەربردنی شـەوێکی هـەنگوینی بـەر لـە خۆرهـەڵات لێك جیادەبوونەوە.

شەوێك خێزانی خارە خولە هاتبووە ئۆردوگـای (دارەتـوو) بـۆ هـەمان یەکتر دیتن، ئێمە کە زانیمان شتێکی وایە کـەسمان لەگـەڵ خـارە خولـە تەوزیع نەبووین، بۆ ئەوەی خاڵمان ئیسراحەتی خۆی وەرگرێو لەگـەڵ خێزانی تا بەرەبەیان بمێنێتەوە، لە بیرم ماوە شوێنی یەکتر دیتنەکەش مـاڵی کـاك (ڕەسـول)ی خزمـی بـوو، دیـارە دوای بڵاوبوونـەوەی ئێمـە (خولەی گچکە) کە بە تەمەنیش هەر بچووك بـوو، سـەری لـەو بـەزمو ڕەزمە دەرنەدەچوو کە دەبینێ، خاڵ بە تەنیا ماوەتەوە، وا دەزانێ ئێمە خارە خولەمان لە بیرکردووەو بە تـەنیا بـەجێماوە ! بۆیـە بڕیـار دەدات لەگـەڵی تـەوزیع بێـتو دەکەوێتـە دوایو دەڵـێ: (نابێـت تـۆ بـە تـەنیا تـەوزیع بیـت، مـن بـە تـەنیا خـاڵی خـۆم جێنـاهێڵم)، خـارە خولـەش

هەرچەند دەڵێ: (کاکە برۆ لەگەڵ هاوڕێیان خەمی منت نەبێت ، من دەچمە ماڵی خزمو شتی وا)، ئەو هەر دەڵێ: (من خاڵی خۆم بە تەنیا بەجێناهێڵم)، وەك بنیشت پێیەوە دەنووسێت، ناچار خارە خولەش بێدەنگ دەبێتو خولەی گچکە دەکەوێتە دوایو دەچنە ماڵی کاك (ڕەسوڵ) و نان دەخۆنو دیارە چەند جارێك کاك (ڕەسول) یش بەبەر گوێی خولەی گچکە هەڵدەدا کە خاڵە بەجێبهێڵێت، بەڵام ئەو هەر دەڵێت: (من خاڵی خۆم بە تەنیا بەجێ ناهێڵم)، ئیتر وردە وردە کات درەنگ دادێو چەند جارێك دەڵێنە خولەی گچکە ئەگەر خەوت دێت بنوو کە هاوڕێیان ڕۆیشتن بانگت دەکەین، هیچ فایدەی نابێت، شەو درەنگ دادێو (خارەخولە)ی فەقیر ناچار دەبێت بە نادڵیو بە ..... هتد خواحافیزی لە دایکی منداڵەکانی دەکاتو یاغریاغر دێنەوە لای هاوڕێیان.

کە هاتنەوە هەموو لای سەیارەکان بووین کەسمان نەماندەزانی خاڵمان بەدەست خولەی گچکە تووشی ئەو بەزمە هاتییەو هەر بە سعری خۆی دەرچووە، ئێستاش لەبەر چاومە کە گەیشتنەوە لای ئێمە چۆن خارە خولە تفەنگەکەی لە شانی هێنا خوارو وەك چۆن بیەوێ لە خولە بدات، بەرزی کردەوەو نزیکی کردەوە لە سەری، بە خولەی گچکەی وت: (شەیتان دەڵێ یەك قۆنداخەی لە تەختی نێوچەوانی بدەو دایکەکەی بگیو وەك سەگ بیتۆپێنە، لە ئێوارەوە دەڵێ: خاڵی خۆم بەجێناهێڵم، وادەزانی گورگ دەمخوا سەگی سەگباب)، ئەوجا ئێمە تێگەیشتین چ ڕوویدایەو بووە پێکەنینو هاوڕێیەك وتی: (کورە خولە ئەو کەتنەت کردییە)، سەیر لەوەدابوو خولەی گچکە تا ئەو کاتەش

هەر لە وەزعەکە نەدەگەیشت‌و هەر دەیوت: (ئێ هاوڕێیان ئەنگۆ هەموو ڕۆیشتن‌و خارە خولەتان بە تەنیا بەجێهێشت تەنها من بەجێم نەهێشت لەباتی چاکەی خۆشتان تورە دەکەن؟!!.

* ئەم بەسەرهاتەم بە مۆڵەتی خۆی لە لاپەڕەی فەیسبوکی پێشمەرگەی دێرین و هاوسەنگەری خارە خولە، هاوڕێ (فەرهاد رەسولی ناسراو بە چەتۆی بەڕانەتی) وەرگرتووە بە سوپاسەوە .

**خارەخولەو خیامی قەرەچوغ ***

زستانی (نۆکان) هەرچەندە سارد و ناخۆش بوو بەلاَم شتی خۆش و پێکەنیناویشی هەبوو دەکرێ وەك یادێك لە هاوڕێیان و ئەو ژیانەی ئەو کاتی ئێمە باسی لێبکرێ کە بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی پێشمەرگە بوون سەرەڕای خەم و ناخۆشی و دووری لە کەس و کار ،

لەبەر هاتنی وەرزی زستان و ساردو سەرمای سەر سنوور بە پەلەپەل ژوورەکانمان ئامادە کرد بۆ حەوانەوەی هاوڕێیان کە لە هەموو ڕوێك کەموکوڕی هەبوو ، پەنجەرەی ژورەکان بە دار و نایلۆن گیرابوو بەبێ ئەوەی حیساب بۆ هەواگۆڕکێ بکرێ شەوان لەگەڵ دوکەڵی جگەرە و قەڵەبالغی هاوڕێیان زۆر تەنگە نەفەس دەبووین ، منیش لە ژوورەکەی خۆمان لە هەموو پەنجەرەکان ، بە دار و پەلارەی دەستم کەوت شوێنی هەوا گۆڕکێم لێ دروست کردن کە هەتا ڕادەیەکی باش کەلکیان هەبوو.

خارەخولە کە ئەوەی دیت داوای لێکردم بۆ ژورەکەی ئەوانیش هەمان کار بکەم ، دیاربوو هەندێك تەختە داریشی پەیدا کردبوو ، منیش دەستم پێکرد و لەگەڵ خارەخولە بەقسەی خۆش خەریك بوین .

کاتێك هاوڕێ ( خەیامی قەرەچوغ ) کە لەهەمان ژووری خارەخولە و ئەوان بوو هاتە لامان و سەیری کرد من بەهەر شێوەیەك و بە چەقۆیەکی خراپ خەریکی ڕێك خستنی تەختەکان بووم ، بە

پێکەنینەوە وەك عادەتی هەمیشەیی خۆی گوتی ( هاوڕێ ئەو دارانە لە ڕەندە بدە باشە)  تەماشایەکی خارەخولەشی کرد و گوتی ( کەپوی خارەخولەش لە ڕەندە بدە با هەندەك جوان بی چونکە کەپوی خارە بەرانانیە ) من هیچ دەنگم نەکرد و چاوڕێی وەڵامی خارەخولەم کرد زانیم ئێستا وەڵامێکی تەڕی دەداتەوە ، یەکسەر خارەخولە گوتی ( کورە ڕەندەی لە کێ بینم هەی داك حیز مەگەر لە ڕەندەی دایکتی بدەم ) ، ئیتر هاوڕێ خەیام بە پێکەنینەوە بە جێی هێشتین .

٭ ئەم سەرهاتەم بە مۆڵەتی خۆی لە لاپەڕەی فەیسبوکی پێشمەرگەی دێرین و هاوسەنگەری خارە خولە هاوڕێ (فەرهاد رەسول ناسراو بە چەتۆی بەڕانەتی) وەرگرتووە بە سوپاسەوە.

## پێشبینییەکەی خارە خولە

زستانێکی ساردەو بارانێکی وا دەباری فلچەی ئۆتۆمبیل پێرا نەدەگەیشت! لەگەڵ (ملازم هەژار) ئۆتۆمبیلێکی جۆری (مسیۆبۆشی)مان لە لایە، گەیشتینە بەستی (شەرغە)، دوای نیوەڕۆیەو برسیمانە، وتم: هاوڕێ هەژار هەتا کات ماوە، با پێش نانی ئێوارە خۆمان بگەیێنینە ماڵی (خارە محەممەد*)ی لە گوندی (باغەمرە)، دەزانم ئێستا (خارە محەممەد) بانگی دایکی منداڵانی کردووەو وتویەتی: ئافرەت دەرفەتە مریشکێکی خۆمانە بە ناوی خۆی لێنێ، با ئەوڕۆ بە تەنها بیخۆین، خۆ پێشمەرگە هار نەبووە، بەو باو باران و تۆفانە بێنە گوندی!، هاوڕێ ملازم هەژاریش بە گوێی کردمو پێش نانی ئێوارە گەیشتینە بەردەرگای ماڵی (خارە محەممەد)ی لەگەڵ ملازم هەژاری چووینە ژوورەوەو گوتم: سەلاموعەلێك (خارە محەممەد) وتی: پەکوو خارە ئەوە کوو گەیشتنە ئێرە؟!
خارە خولە منیش باسی پێشبینییەکەم بۆ کردن کە ئەمڕۆ مریشکتان هەیە!، (خارە محەممەد)و منداڵەکانی دەستیان کرد بە پێکەنین و (خارە محەممەد) وتی: وەڵلا (خولە) ئەمنیش دەق ئەوهام بە دایکی منداڵان وت، ئەویش مریشکێکی خۆمانەی بە ناوی خۆی لێناوە.

* (محەممەد سەعدوون) دەکاتە باوکی پێشمەرگەی دێرین هاوڕێ (نافیع - دکتۆر فاخیر) لە بارەی ئەم سەرهاتەوە پەیوەندیم بە ( دکتۆر فاخیر ) کرد ووتی من خۆم شاهیدی ئەم بەسەرهاتەی خارە خولەم ، چونکە ئەو کاتە لە ماڵ بووم و هێشتا نەببومە پێشمەرگە .

## پێشمەرگایەتی و ناوبانگ

هەر کاتێك بڕیاری ئەوە دەدرا کە مەفرەزەیەك بێتە خوارەوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی حزبی، یان چالاکییەکی سەربازی، هەموو پێشمەرگەکان بە گیانێکی لە خۆ بردووانەو بە بیروباوەڕێکی پۆڵاین پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەندامێك بن لەو مەفرەزەیە!. ڕۆژێکیان مەفرەزەیەك ئامادەی ڕۆیشتن بوو، هاوڕێیەکمان بە ناوی (دلێر) کە ئێستا مامۆستایە، دوو هەفتە بوو ببووە پێشمەرگە، بانگی کردم (خارە خولە خارەخولە)، منیش وتم: بەڵێ هاوڕێ گیان وتی: منیش حەز دەکەم بێم!، منیش هەر بۆ گاڵتە وتم: هەی کەر لە قوزی دایکت با، ئەتوو بە خۆت بە حەفت مانگی لە دایك بوویتو دوو ڕۆژیشە بوویتە پێشمەرگە، دەتەوێ ناوبانگ دەربکەیت!، جارێ هەر لە بارەگا بمینێوە!، هەموو هاوڕێیان بە هاوڕێ دلێریشەوە دایانە قاقای پێکەنین، دوایی زانیم هەر بە ڕاستی هاوڕێ (دلێر) بە حەوت مانگی لە دایك بووە.

## ناو سێرییەکەی گوندی پۆڕیجە

لەگەڵ مولازم هەژار گەیشتینە گوندی پۆڕیجەی دەشتی هەولێر، بە نیازی نانخواردن لە دەرگای ماڵێکماندا، دوای چوونە ژورەوەو دانیشتن بە خاوەن ماڵمان وت: ڕاستە کاتەکە کاتی نانخواردن نییە، بەلاّم ئێمە بۆ نانخواردن لاماندا وە!

خاوەن ماڵ بە دەنگێکی بەرز بانگی منداڵەکانی کردو وتی: میوانەکان نانیان نەخواردووە، دوای چەند دەقیقەیەك دوو پیاڵە چای‌و سێنییەك* ناوسێری** یان لە پێش دانایەن، ناوسێری چ ناوسێری ئەوەندە ڕەق بوو دەتوت هەسانە! لە ملی تاژیت بدابوایە دەیبڕی! باش بوو کوڕێکی خاوەن ماڵەکە زوو زوو فریامان دەکەوت‌و پیاڵە چایەکیتری بۆمان دەهێنایەوە، ئەگەرنا خوا عالیمە هەموو گەرومانی لە ژوورەوە دەدڕی!، هەر چۆنێك بوو ناوسێریەکەمان خوارد، بەلاّم خۆم پێڕانەگیرا بە خاوەن ماڵم وت: مام حاجی مانگی ڕەمەزان زۆری ماوە؟

خاوەن ماڵیش وتی: هەیهو.. هەیهووووو کاکە ئەمە لە کێ ڕەمەزان لە کێ!

بە پێکەنینەوە وتم: ئەدی ئەو ناوسێرییە چی بوو هەموو شەویلاك‌و ددانەکانمان ژان دەکات، بە خۆمان ڕێگامان دوورەو یەکەو مەتارەیەك ئاومان لە لایە خۆ بە گالۆنە ئاوەکیش تێنیاتیمان*** ناشکێت.

له کوردەواری بە تایبەتیش لە دەشتی هەولێر لەبەر دەست نەکەوتنی هەموو جۆرە خواردنێکو خراپی باری ئابووری، خەڵك لە مانگی رەمەزان (پاشێوانو بەربانگ) کردنەومیان بە ناوسێری بووە، بەو پێیەی هەموو ماڵێك ئاردو رۆنی هەبووەو ناوسێریش ئەو کولێرمیەیە لە رۆن سوور دەکرێتەوە.

* سێنی: سنی ، خوانچە

** ناوسێری: نانساجی

*** تێنیاتی: تێنوێتی

## سەددام بە پێشمەرگە ناوێرێ ، تووتن و جگەرەش نایکوژێ

بە مەفرەزە گەیشتینە ناوچەی زرارەتیو بۆ نانخواردن دابەش بووینە سەر ماڵەکان، من و دوو هاوڕێیتر چووینە ماڵێك تا نان ئامادەبوو, پیاوی خاوەن ماڵ تاو نا تاوێ دەیوتە من جگەرەیەکم بۆ لە تووتنەکەت بپێچەوە ! منیش جگەرەیەکم بۆ دەپێچایەوە, بەڵام کار وا بڕۆیشتایە نە من تووتنەکەم دەماو نە خاوەن ماڵیش بە ئاسانی بەرۆکی بەردەدام, خاوەن ماڵ لە ژوورەوە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانێت، نان ئامادەکردنەکە چەندی ماوە, منیش بە دەرفەتم زانی نیوەی توتنی کیسەکەی ئەوم لە ناو کیسەی تووتنی خۆم کرد!، پیاوەی خاوەن ماڵ چوار جگەرەی لە تووتنەکەی من کێشابوو، نەیوت دەستتخۆش بە ڕاستی تووتنێکی خۆشە!!، کە هاتەوە ژوورەوە وەك جاران وتی: هاوڕێ جگەرەیەکم لە تووتنەکەی خۆت بۆ بپێچەوە!، منیش جگەرەیەکم لە تووتنەکەی خۆی بۆ پێچایەوەو دامە دەستی پیاوەی خاوەن ماڵ، لەگەڵ هەر مژێکی دەیوت: هەی مارت کاول نەبی ئەو جگەرە توندو ناخۆشەت کوو پێ دەکێشرێ!، باش بوو لە سایەی ئەو فێڵە جگە لە جگەرەی یەکەم کە هەر لە تووتنەکەی خۆی بوو تەنها جگەرەیەکیتری لێداواکردمو وتی: کاکە سێ چار جگەرەی یەکەم تامی لە دەمم زۆر خۆش بوو! بەڵام ئێستا هەستم پێکرد جگەرەکەت

زۆر خراپه، وا بڕوات قوڕگم داده‌خات. ئیتر ئێمه‌ش ده‌ستمان کرد به پێکه‌نین و وتم: مام حاجی خه‌می پێشمه‌رگه‌ت نه‌بێ، مادام سه‌ددام ده‌رهه‌قه‌تی * پێشمه‌رگه نایێ ! تووتن و جگه‌رەش نایکوژێ.

* ده‌رهه‌قه‌ت: له هه‌ق

## رۆژی سه‌یان و گوریسه‌كه‌ی هه‌وێره

★ مه‌فره‌زه‌یه‌كی چوار هاوڕێ بووین گه‌یشتینه (شیوه‌دزێ)ی ده‌شتی بیاوێ، بۆ نانخواردن چووینه ماڵێك, كه‌شوهه‌وا زۆر ساردبوو، به‌فرو كرێوه بوو,و منیش وتم: ئه‌و ساردو سه‌رماو به‌فره رۆژی پێشمه‌رگانه! خاوه‌ن ماڵیش به‌بێ ئه‌وه‌ی بیر بكاته‌وه وتی: كوڕه وه‌ڵلا رۆژی سه‌یانه!، ئێمه‌ش ده‌ستمان كرد به‌ پێكه‌نین، خاوه‌ن ماڵ ته‌ریق بۆوه, ناچار باسه‌كه‌ی گۆڕی‌و وتی: من مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه‌ سه‌گیش زۆر حه‌زی له‌ ساردیه‌و سه‌رمای نابێ.

★ مه‌فره‌زه‌یه‌كی ده‌ پانزه‌ پێشمه‌رگه‌یی بووین یادیان به‌خێر شه‌هید (عه‌باس) سه‌رلق بوو، شه‌هیدان (سه‌ربازو بڕیارو سه‌فه‌ر)و هاوڕێیان (شێخه‌و كاروان‌و عه‌ولا پۆلاو ..... هتد )، ئۆتۆمبیلێكی جۆری (تویۆتا)ی تاكمان پێیه‌و سێ به‌شی مه‌فره‌زه‌كه‌ له‌ دواوه‌ی تویۆتاكه‌ بووین, گه‌یشتینه‌ گوندی (هه‌وێره)ی ده‌شتی شه‌مامك, ژنێك ئێمه‌ی بینی كه‌ له‌ دواوه‌ی ئۆتۆمبیله‌كه‌ كه‌وتبووینه‌ سه‌ر یه‌كتری، جێگامان زۆر ناخۆش بوو، به‌شی زۆرمان له‌ سه‌ر لێواری دواوه‌ی تویۆتاكه‌ سوار ببووین! وتی: كوڕه‌كانم ئه‌وه‌ ئێوه‌ له‌ ڕاوه‌ستانێ جێگاتان ئه‌وه‌نده‌ ناخۆشه‌ ئه‌دی له‌ رۆیشتنێ به‌رنابنه‌وه؟
وتم: به‌رێ وه‌ڵلا مامۆژن ئه‌گه‌ر دوو سێ مه‌تره‌ (گوریس)مان بۆ بێنی بۆ ئه‌وه‌ی خۆمان پێ ببه‌ستینه‌وه ئێمه‌ مه‌منونین؟، ژنه‌ به‌ ڕاستی تێگه‌یشت‌و وتی: باشه‌ هه‌ی به‌ قوربانتان بم، چووه‌ ماڵه‌وه گوریس بێنێ, هاوڕێیان ده‌ستیان كرد به‌ پێكه‌نین‌و گونده‌كه‌مان به‌جێهێشت.

**خاره خولەو درع**

لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی نۆهەتـەكان ، حزبـی شـیوعی و یـەكێتیو سۆسیالیستو زەحمەتكێشان بڕیاریانـدا بـە هەماهەنگی هێرش بكەنـە سەر بەشێك لەو هێزو سەربازگانەی سنووری هەولێر- دیبەگە لە ڕێگای مەخموور، هەولێر-گوێڕ لە ڕێگای گوندی عەوێنە، لەگەڵ ئـەم دەنگۆیـە هەر حزبەو بانگی پێشمەرگە دێرینەكانو ئەنـدامانی خـۆی كـردو پێـی ڕاگەیانـدن كـە بەشـداری كردنتـان ئارەزوومەندانەیـە، بـەڵام دەبێـت كەسانێك سـەركردایەتی مـەفرەزەو پێشـمەرگەكانی خۆمـان بكـەن كـە پێشمەرگەی دێرین بن، یەكێ لەوانەش (مـن - خـارە خولـە ) بـوو، ئـەو كاتەش ڕۆحی شۆڕشگێڕیو نیشـتیمانپەروەری لـە لای گەنجـەكانمان لـە لوتكەدا بوو، بۆیە لەگەڵ دەنگۆی پێكهێنـانی هێـزی پێشـمەرگە سـەدان هاوڕێی گەنـج هاتن خۆیـان نـاونووس كـرد، دوو لـە گەنجـەكان ناسـیاوی خۆم بوون وتویان: خارە خولە دایكم سڵاوی هـەبوو بـۆت، وتـی: كـوڕم ئێوە پێشمەرگایەتیتان نەكردووەو شەڕتان نەبینیووە ئەگەر بووە تەقە خۆتان لە پشتی خارە خولە بنێن!، منیش بـە پێكەنینـەوە گـوتم: هـەی كەر دایكو بگێ لۆ خارە خولە درعە هەتا ئێوە بپارێزی..!!

**گەوادەك نییە لەگەڵ خۆی بمهێنێ..! ***

دوای ئـەوەی خـارە خولـە لەگـەڵ هاوڕێیـانی محـەلیی هـەولێر، دەچـنە پرسەی خزمی هاوڕێیـەکی حـزب لـە شاروچکەی پـردێ، لـەوێ لـەکاتی بەڕێکردن،( رابەر رەشید) ی رۆژنامەنووس، وەکو ئـەرکی سەرشـانی لـە پرســەکە دێتــە دەرەوەو هاوڕێیــانی حــزب بــەڕێ دەکــات، دیــارە رابــەر رەشـید بـەو پێیـەی مـاوەی چـەند سـاڵێك لـە راگەیاندنـەکانی حزبـی شــیوعی کوردســـتان بەرنامـــەی "دەنگـــی جووتیـــاران"ی هـــەبووەو سەرنووسەری رۆژنامەی "دەنگی جوتیـاران"و ماوەیـەکیش پـەیامنێری تەلـەفزیۆنی ئــازادیی هــەولێرو دواتــریش کــەرکوك بــوو، نوێنــەری رۆژنامەنووسانی کەرکوکیشە لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، بۆیە زۆربەی هەرە زۆری هاوڕێیانی حزب، بـە تایبـەتی هەولێرییـەکان دەناسێت، ئیدی لـەکاتی بەڕێکردنـدا هـەر بـۆ شـۆخی گێچەڵ بـە خـارە خولە دەکـاتو دەزانێـت تـوانجێکی خـۆش.. یـان جوونـەکی مـزر دەدات، بۆیە سەردەکاتە سەریو بەوە سەرزەنشتی دەکات، کە بێوەفایەو رۆژێـك لە رۆژان سەردانی هاوڕێیانی پردێو دۆستو برادەرانـی ناکـات !، خـارە خولە بـە رابـەر دەڵێـت : پیـاوی چاکبە وازم لێبینـە، ئـەویش وازی لـێ ناهێنێتو – بیلا مەعنا - هەر دەیخورێنێتـەوە ، ئیـدی خـارە خولـەش لـە دەرەوەی پرســەکە، روو دەکاتــە هاوڕێیــانی بــەرپرسو بــە دەنگێکـی بڵند دەڵێت: ئێ هاوڕێ رابەر کاکە ئەتوو لۆ گلـەییان لـە مـن دەکـەیت ،

دمنا به حەقی خودای گەوادەك لەو گەوادانەی لەگەڵ خۆیان نامهینن، ئەگەرنا ئەمن لای تووم هەر بەتارە ..!!
ئیدی یەکێك لە هاوڕێ بەرپرسەکان روودەکاتە هاوڕێ رابەرو دەڵێت: زوو زانیم لەگەڵ خارە خولەی شتەکتان لە بن سەرییە، ئاخرییەکەی بە خارە خولەت کرد..!! ئیدی هەموویان دەدەنە قاقای پێکەنینێ، وەك ئەوەی هەر لۆ پرسەش نەهاتبن ..!!.

٭ لە سەر زاری رابەر رەشیدەوە وەرگیراوە

## قسه خۆشەكانی شەهید كانەبی گچكە

یادی بەخێر شەهید كانەبی گچكە چەندە تێكۆشەرو پێشمەرگەیەكی ئازاو چاونەترس بوو، ئەوەندەش قسەخۆش بوو، ئەمانە بەشێكن لە یادەوەریەكانم لەگەڵ ئەو شەهیدە قارەمانە.

* كە بە مەفرەزە دەهاتینە خوارەوە هەر كاتێك شەهید كانەبی تێنووی بوایە، دەیوت: خارە خولە قومێك ئاوم لە مەتارەكەی خۆت بدێ..!

مەتارەكەی منیش هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ مەتارەكەی ئەو نەبوو، دەموت: باشە بۆچی لە مەتارەكەی خۆت ناخۆیەوە؟!
شەهید كانەبی دەیوت: ئاخر هی تۆ ساردترە..!
دەموت: كورە ساردتری چی هەی سەیە خۆ ئەمن سەلاجەم بە قەدێوە نییە.. !
شەهید كانەبی دەیكردە پێكەنین‌و دەیوت: دەمەوێ وەكو تۆ ئازابم..!

* جارێكیان شەهید كانەبی وتیە هاوڕێ (سەلمان)ی: هاوڕێ گیان هەندێك دار بێنەو ئاگرەكی بكەوەو چایپەستەكەی بە جوانی بشۆو هەندێك ئاوی تێكەو تۆ چایەكەش لە بیر نەكەیت كە كولا منیش

ده‌یخۆمه‌وه ! هاوڕێ سه‌لمانیش به توانجه‌وه وتی: ئه‌وجه لۆ وه‌ك ژنه‌كی باش جله‌كانیشت لۆ نه‌شۆم؟! .

★ كوردێكمان به جلی (جه‌یش شه‌عبی) گرت، ئه‌و جله هی ئه‌وه بوو، كه زۆر جار به‌عسییه‌كان بۆ هه‌ڕه‌شه‌و چاوسوووركردنه‌وه‌و بێزاركردنی كورده‌كان به زۆر بڕیاری ئه‌ومیان به‌سه‌ر داده‌سه‌پاندن كه بۆ ماوه‌یه‌ك ببنه پاسه‌وان یان وه‌ك به‌رگری و خۆبه‌خش ره‌وانه‌ی به‌ره‌كانی شه‌ڕیان ده‌كردن!

ماوه‌ی نیو كاتژمێرێك ئه‌و پیاوه‌مان له لا بوو، پاشان ئازادمان كرد، هاوڕێ كانه‌بی هه‌ندێك ئامۆژگاری كرد كه خۆڕاگربێت و رووبه‌ڕووی به‌عسییه‌كان بێته‌وه‌و چیتر ئه‌و جله له‌به‌ر نه‌كات!

پیاوه‌كه له لایه‌ك له ترسان له لایه‌ك له ساده‌یی خۆی وتی: به‌خوا له ئێوه كوردترم!

شه‌هید كانه‌بی وتی: له ئێمه ته‌ڕه‌ستری، كوردایه‌تی ئه‌گه‌ر ئاوا بێت زۆر ئاسانه!!.

## به‌سه‌رهاتی عه‌ولا

وه‌ك بەڵێنم پێدابوون به گوێره‌ی ده‌رفه‌ت قسه‌كانی خاره خوله‌تان بۆ بگوازمه‌وه، ئه‌مڕۆش وه‌ك ڕۆژانیتر له پرسگه‌ی باره‌گای هه‌ولێر یه‌كترمان بینی، وتی: له‌و هه‌مووه چیاو چۆله نه‌گوزرام، ئه‌تو به‌و (ته‌ڕه‌ماشه‌ی) سه‌رم له قوڕێ ده‌نێی!

مه‌به‌ستی فه‌یسبووك بوو، پاشان وتی: ها به‌شه‌كه‌ی خۆت وه‌رگره مستێ* فستق‌و به‌داملی** خسته ده‌ستم.

وتم: خاره بیكه دوو مشت !

وتی: به‌سه ڕه‌شوڕووت زۆرن !

پیاوێك هه‌بوو به ناوی عه‌ولا، پێنج فه‌رزه ده‌چووه نوێژی جه‌ماعه‌ت، هاوه‌ڵانی مزگه‌وت پێیانده‌وت: تۆ له كاتی نوێژكردنا له حزوری خودای گه‌وره ده‌وه‌ستی، بۆچی كڵاوێكت له‌سه‌ر نییه؟!

له ده‌ره‌وه‌ی مزگه‌وتیش پێیانده‌وت: بۆچی پشتێنێكی جوانت له پشتت نه‌به‌ستاوه؟

بۆ پێڵاوێكی چه‌رمیت له پێدانییه؟!

عه‌ولا ده‌ستی بۆ ئاسمان به‌رز كرده‌وه‌و وتی: خوایه گیان زۆر شوكرم كه فه‌قیرت كردیمه، به‌س لۆ سه‌ت تێبه‌ردایمه.. سه *** !

منیش زۆر پێكه‌نیم‌و وتم: باشه خاره خوله توانجه سیاسییه‌كه‌ت له‌سه‌ر ئه‌م سه‌رگوزه‌شته‌یه چییه؟

خاره وتی: حزبەکەی ئێمەش پارەو زەوی نییە بیبەخشێتەوە،
هێزی چەکداری نییە، چاو لە خەرکی**** سۆرکاتەوە!
کورسـی پەرلەمانیشـمان زۆر نـەهێناوە، ئـەوجا کۆمـەڵێ سـە پێمـان
دەوەڕن.

* مستێ : مشتێ
** بەداملی : شیرینی، نوقل
*** سە : سەگ
**** خەرک : خەڵك

## چیرۆکی شەش برا

ماڵێکی هەژاری گوندنشین خاوەنی شەش کوڕ بوون، دایکی کوڕان هەموو جار سکاڵای دڵی خۆی هەڵدەڕشت، دەیوت: خوایە گیان مردم پسام لە ناو خەمان! چ دەبوو ئەگەر لەو شەش نێرەکەرە هەر یەکێکیانت بکردابوایە کچ؟! هەتا وەك کابانێ گچکەی ماریێ یارمەتییەکی دابام !

ڕۆژان هاتن‌و ڕۆژان ڕابرد، کوڕی گەورە کاتی ژنهێنانی هاتبوو، زۆری لە دایك‌و باوکی دەکرد بە هەر شێوەیەك بێت دەبێ ژنێکی بۆ بهێنن، باوکی کوڕەش لەبەر ئەوەی کچی نەبوو، تا ژن بە ژنی، یان گەورە بە گچکەی بۆ بکات، ناچار دەستی نا بە جەرگی خۆی‌و تاقە سەرچاوەی داهاتیان کە چێرێك* بوو فرۆشت‌و بە پارەکەی ژنێکی بۆ کوڕە گەورەی هێنا.

دوای دوو ساڵ قەدەری خوا وابوو کوڕە گەورە مردو منداڵێکی لە پاش بە جێ ما، چەند مانگێك دوای ئەم ڕووداوە کوڕی دووەم پێداگری کرد کە ئیلاو بیلا ژنی دەوێ.

باوکی کوڕە ناچار لەبەر بێ پارەیی‌و دابونەریت‌و سۆزی منداڵی کوڕەی یەکەمی بڕیاریدا کە کوڕی دووەم ژنی براکەی مارە بکاتەوە..!!

دوای چوار ساڵ‌و بە موقەدەری خودای کوڕی دووەمیش مردو دوو منداڵی چاو گەشی لە پاش بەجێما..!!

هه‌مدیسـان دوای چـه‌ند مانگێـك كـوڕی سـێیه‌م ده‌چـووه‌ په‌ڕپـه‌ڕه‌ی ئاسمانی‌و ده‌یوت ئیلاو بیللا ژنم ده‌وێ !

ده‌روجیران پێیانزانی‌و كه‌وتنه‌ نێوانیان كه‌ وا باشه‌ كوڕی سێیه‌م (ژنـی براكه‌ی) ماره‌ بكاته‌وه‌ !

باوكی كوڕه‌ش له‌به‌ر بێ پـاره‌یی‌و دابونـه‌ریت‌و سـۆزی منـداڵی كـوڕه‌ی یه‌كه‌م‌و دووه‌مـی پێـی خـۆش بـوو كـه‌ كـوڕی سـێیه‌م براژنه‌كـه‌ی مـاره‌ بكاته‌وه‌ !

سه‌رتان نه‌هێشێنم كورده‌واری گۆتـه‌نی براژنـه‌خان سـه‌ره‌خۆره‌ بـوو! پێنجانی خسته‌ ژێر گڵ!

لــه‌ كــوڕه‌ی شه‌شــه‌م ته‌مــه‌نیان زۆر جیــاواز ببــوو، كــوڕه‌ش له‌بــه‌ر چاوه‌چاوكردنی له‌گه‌ڵ كچانیتر كه‌متر سه‌رجێی له‌گه‌ڵ ژنه‌ ده‌كرد!

ڕۆژێكیـان لێیـان بـوو بـه‌ ده‌نگـه‌ده‌نگ‌و ده‌مـه‌ قـاڵی كـوڕه‌ی شه‌شـه‌م‌و جێگـره‌وه‌ی پێـنج بـرا، دارێكـی له‌سـه‌ری ژنه‌یـداو خـوێن بـه‌ بـه‌ژنی داهاته‌خوارێ !

ژنه‌ش به‌ گریانـه‌وه‌ ده‌یـوت: عـه‌مرێ مـن نـه‌مینێ، شـه‌ش بـرا بـوون، نه‌تانده‌زانی كه‌رێ بگێن، هه‌مووتانم فێره‌ گان كردن كرد، كه‌چی ئێستا سه‌رم ده‌شكێنن!

كـه‌ گوێبیسـتی ئـه‌م وه‌ڵامـه‌ی ژنـه‌ بـووم پـڕ بـه‌ ده‌نگـم لـه‌ تریقـه‌ی پێكه‌نینێمداو خه‌ریك بوو ده‌بورامه‌وه‌ له‌ خۆشیان، وتم وه‌ڵلا خاره‌ ژنه‌ ناهه‌قی نه‌بووه‌، خۆی ئاسا بۆتـه‌ هـه‌وێنی ماڵه‌كه‌! بـه‌ڵام خـاره‌ خولـه‌ توانجه‌ سیاسیه‌كه‌ت و حیكمه‌ت چی یه‌ له‌ گێڕانه‌وه‌ی ئه‌م چیرۆكه‌؟

خاره وتی: هاوڕێ سامان ئه‌وه ده‌ق حزبی ئێمه‌یه هه‌موو حزبه‌كانمان فێری سیاسه‌ت كرد، كه‌چی ئێستا پرمان ده‌ده‌نێ‌و ده‌ڵێن كورسی په‌رله‌مان ده‌یخوات، نه‌ك مێژووی پاك‌و سیاسه‌تی ڕاست‌و پرۆژه‌ی نیشتیمانی‌و نه‌ته‌وایه‌تی‌و .... هتد.

* چێر : چێڵ، مانگا

## پیاوێکی پیاده‌و بازرگانه‌ مشه‌خۆره‌کان

پیاوێکی پیاده، ڕۆژه‌ ڕێیه‌که‌ به‌ڕێوه‌یه‌، گه‌رمای بیابان‌و برسیه‌تی پەکی خستووه‌و له‌ تێنوێتیان زمانی له‌ ناو ده‌می وشك بووه‌ ! له‌ ناکاو له‌و بیابانه‌ تووشی چوار پیاوی کاروانچی بوو، که‌ به‌ خۆو به‌ وشتره‌کانیانه‌وه‌ خه‌ریکی بازرگانی بوون، پیاوه‌ی پیاده‌ ڕووی گه‌ش بۆوه‌و هانای بۆبردن که‌ به‌ هیمه‌ت بێت، یان به‌ قیمه‌ت قومێ ئاوی بده‌نێ، ئه‌گه‌ر پارچه‌ نانێکیشی له‌گه‌ڵدا هه‌بێت ئه‌وه‌ باشتر.

کاروانچییه‌کان وتیان: هه‌ردووکمان له‌ لایه‌، به‌ڵام ئێمه‌ش زۆر به‌ زه‌حمه‌ت ده‌ستمان که‌وتووه‌و ئه‌و شارو ئه‌و شارو ئه‌م وڵات ده‌که‌ین، تا قازانجێك بکه‌ین، له‌وه‌ش گه‌ڕێ جارجاره‌ش تووشی ڕێگرو جه‌ردان ده‌بین‌و ده‌مانرووتێننه‌وه‌!؟

کابرای پیاده‌ زۆر پاڕایه‌وه‌ که‌ به‌ خوا ئه‌و دزو جه‌رده‌ نییه‌!، کاروانچییه‌کان وتیان: کێشه‌ نییه‌! به‌ڵام ئه‌م دوو قرۆشه‌ی تۆ له‌و سه‌حرایه‌ به‌شی ئاو و نان ناکات، بۆیه‌ ئێمه‌ به‌ هه‌ر چوارمان کاری به‌دڕه‌وشتیت له‌گه‌ڵ ده‌که‌ین!

کابرای پیاده‌ چه‌ندیان لێ پاڕایه‌وه‌ که‌ خوا هه‌یه‌و پێغه‌مبه‌ر هه‌یه‌، تووشی ئه‌و گوناحه‌ی نه‌که‌ن‌و له‌و ده‌شت‌و سه‌حرایه‌ له‌ مه‌رگ ڕزگاری بکه‌ن.

بازرگانه‌كان وتیان: ئه‌وه یه‌كه‌م‌و دوا داواكاری ئێمه‌یه‌، چه‌ند مه‌ترێك له كابرای پیاده دوور كه‌وتنه‌وه‌، كابرا سه‌یرێكی خۆی كرد، مه‌رگ چه‌ند ده‌قیقه‌یه‌كی ماوه ده‌ستی بۆ ئاسمان به‌رز كردەوەو وتی: خوایه گیان ئه‌تووبه خۆت ده‌زانی ئه‌من له چ باره‌كی خراپ دامه‌، كه‌چی له جیاتی ئه‌وه‌ی دوو پیاوی به ئیمانم بۆ بنێری، چوار خۆڕی نێره‌كه‌رت لۆ ناردیمه‌!، بۆیه ئه‌و گوناهه‌م له‌سه‌ر حساب مه‌كه‌!

كابرای پیاده دڵی ڕازیكردن‌و كونده ئاوێك‌و چه‌ند نانێكی لێوه‌رگرتن‌و هه‌ردوو لا به ڕێگای خۆیاندا ڕۆیشتن، دوای سه‌عاته ڕێیه‌ك هه‌مان پیاوی پیاده له‌و بیابانه تووشی چوار ژن هات، كه وه‌ك خۆی په‌رێشانی نان‌و ئاوبوون!

ژنه‌كان وتیانه پیاوه‌ی پیاده: به هیمه‌ت بێ، یان به قیمه‌ت ئه‌و كونده ئاوه‌مان پێ بده‌..!!

ئه‌ویش به ژنه‌كانی وت: ده‌زانن چه‌ند به زه‌حمه‌تی‌و قوندڕایی ئه‌و كونده ئاوه‌م ده‌ستكه‌وتووه‌؟!

ڕووداوه‌كه‌ی وه‌ك خۆی بۆ ژنه‌كان گێڕایه‌وه‌!

وتی: بۆیه لێم نیگه‌ران مه‌بن، منیش به هه‌مان نرخی خۆی ده‌ده‌مه‌وه‌!، ناچار ژنه‌كان ده‌ستیان به‌خۆدا شۆڕكردەوەو ڕازی بوون به داوای پیاوه‌كه‌.

پیاوه‌ی پیاده خه‌ریكی ژنه‌ی یه‌كه‌میان بوو ! ده‌نگێك له له‌زه‌تی خۆشی دابڕاند: پیاوه‌كه پیاوه‌كه هه‌سته له خه‌و ده‌ره‌نگه پاروه‌نانێك بخۆو بڕۆ دوكانه‌كه‌ت..!!

كابرای پیاده كه چاوی كردەوە بینی ژنه‌كه‌یه‌تی..!!

وتی: هه‌ی سه‌ر به گو نه‌دی که به چاران دمیان گام ئه‌تو له کێ بـووی؟
خه‌ریکی تۆڵه‌کردنه‌وه‌ی خۆم بووم!

منیش نیوه فرێکم لـه پیاڵه چایه‌که‌ی ده‌ستم دابـوو، کـه گوێم لـه‌م وه‌ڵامـه نائومێـده‌ی پیاوه‌کـه بـوو، ئه‌وه‌نـده پێکـه‌نیم چـایه‌که په‌ڕیـه گه‌رووم نیوه گیانی کردم !
وتم: باشه خاره توانجه سیاسییه‌که‌ت چییه!؟
وتی: پیاوه پیاده‌که ئه‌و خه‌ڵکه ڕه‌شوڕووته‌یه له سـبه‌ینێ هـه‌تا ئێـوارێ ڕاکه ڕاکه‌یه‌تی، نان‌و زگێکی ده‌ست ناکه‌وێ!
کاروانچییه‌کانیش ئـه‌و بازرگانـه چاوچـنۆك‌و مشـه‌خۆرانه‌ی ئێسـتای کوردستانن، هه‌زاران که‌لوپه‌لی ماوه به‌سه‌رچوو دێنن‌و چاوی نـه‌خۆش کۆره ده‌که‌ن، که‌سیش گونیان ناگرێ!، بۆیه هه‌تا له خه‌ویشدا خـه‌ریکی ڕابواردن‌و قازانجن!
ژنـه‌ش وه‌ك حکومـه‌تی ئێسـتای کوردسـتانه لـه کـاتی پێویسـت‌و زه‌حمه‌تییه‌کان به هاناته‌وه نایه‌ت! له کاتی دڵخۆشیشت ملت ده‌گرێ!

## پاشایەکی هەتیوباز

پاشــایەکی هــەتیوباز هــەبوو زۆربــەی کاتــەکانی لەگــەڵ کــوڕە هەرزەکارەکان بەسـەر دەبـرد، سـاڵانە بـە بیـانووی ئـەوەی کـە پاشـا لـە کۆشك خوێندنگەی تایبەتی بۆ هەرزەکاران کردۆتەوەو فێری خوێندنو کاری دەوڵەتیان دەکات، چەندین هەرزەکاریان بۆ دەهێنایە نێو کۆشـك!، لـە نێـو هـەرزەکارەکان پاشـا لاوە جوانـەکانی دەستنیشـان دەکـرد، ئـەو کاتانــەی ئـارەزووی کـاری سێکسـی بکردبوایـە وەك ئاژەڵێـك خـۆی لـە کــوڕێکی لاو بــەتاڵ دەکــردەوە!.. دوای چــەند ســاڵێك کــە ڕەنــگو ڕووخساری هەرزەکارەکان لەبەر چاوی پاشا ناشرین دەبوو، دەیکردن بە بەرپرسی شوێنێك لـە دەرەوەی کۆشـك، یـەکێك لـەو هەرزەکارانـەی کـە ببووە نێچیری پاشاو بـێ دڵـی پاشـای نەدەکرد،وتییـە پاشـا: قوربـان مـن چەند ساڵە خزمەتی جەنابت دەکـەم، کـە بڕیـارت داوە لـە کۆشـك دەرم بکەیت بمکە بە بەرپرسێکی گەورە..!

پاشاش وتی: ئەوە تۆم کردە (والی)ی بەغدایێ !

پاش چەند مانگێك یەکێکیتر لە نێچیرەکانی پاشا بڕیاری دەرکردنی لە کۆشك بۆ دەرچوو بوو، بە دەرفەتی زانی وەك هاوڕێکەی داوای لە پاشا کرد پۆستێکی گەورەی بدرێتێ..!

پاشاش بڕیاری دەرکرد کە بیکەن بە(قازی) بەغدایێ !

قازی نویٚ برِیاری پاشای وەرگرتو بەرەو بەغدایێ بەڕێکەوت، دوای گەیشتنی بە کۆشکی والی بەغدایێو کۆنە هاورِێی کۆشکی پاشا، دەستی کرد بە گریان!

والی وتی: هاورِێ گیان بۆ دەگری؟.. من (والیو تۆ قازی) کەس لەم وڵاتە لە ئێمە خاوەن برِیارترو گەورەتر نییە!

قازی نوێش وتی: قوربان من بۆ خۆمان ناگریم! بۆ حاڵی ئەو میللەتە دەگرییێم کە من و تۆ بووینە بە برِیاردەرو یاساناسیان..!!

لە کاتی گێرِانەوەی ئەم سەربوردەیەو دانپیانانەکەی قازی ، خەم و ئازارو مەرگە ساتی رۆژانەی عێراقیەکان هاتەوە بەرچاوانم بە زەردە خەنەیەکەوە وتم: خارە خولە ئەوە لۆیە وەزعی عێراق ڕاستەڕێ نابێ، دیارە خوێنی ئەو منداڵبازانەیان لە لەشی داماوە ..؟!

خارە بە پێکەنینەوە وتی: وەڵا وەکو نەخۆشی (ئایدز) ناوچەکەو دەرو جیرانانیشی گرتۆتەوە!

**خوارزای عەتۆلی**

جوتیارێکی گوندنشین کاتی دروونە* کردنی پارچە گەنمەکەی هاتبوو، چەند سەپانێك بە زبارە** خەریکی دوورینەوەی گەنمەکە بوون، کاکەی جوتیار وەختێکی زانی لە لای ڕۆژئاوای پارچە زەویەکە مێگەلە مەڕێك وا لە ناو دەغڵەکەی ئەو دەلەوەڕێن !

برا جوتیار کە بینی ڕانە مەڕێك چۆتە ناو دەغلەکەی دەنگی شوانەکەی داو وتی: کورە هەی سەی لە سەی ئەو مەڕانە وەدەرنێ ئێستا هەموو گەنمەکە دەشکێننەوە***، بەڵام لەبەر ئەوەی نێوان برا جوتیارو سەپانەکان لەگەڵ شوان‌و ڕانە مەڕەکە لێك دوور بوو، کاکەی شوان گوێبیستی جوون‌و هەڕەشەکانی برا جوتیارەکە نەبوو !

بۆیە برا جوتیارەکە خەنجەری خستە بەرپشدێنی‌و سەرکەوتە سەر پشتی ئەسپەکەی‌و بە پەلەو جوێندنان ڕووەو شوانەکە ڕۆیشت ! لەو کاتەش سەپانەکان پشتیان ڕاستکردەوەو وتیان: بەخوا ئێستا خوێن دەڕژێ !

لە دوورەوە تەماشای تاقە سواریان دەکرد کە بەرەو ڕووی کاکەی شوان دەڕۆیشت، وەختێکیان زانی کاکەی جوتیار لە ئەسپەکەی دابەزی‌و ئەملاو ئەو لای کاکەی شوانی ماچ دەکردو لە باوەشی دەگرت!

برا سەپانەکان‌و لەو هەڕەشەو لەو ماچومووچەی کاکەی جوتیار نەگەیشتن! تا کاکەی جوتیار هاتەوە لای سەپانەکان ، ئەوانیش بە جوتیارەکەیان وت: قسەیەك بکە ئەمە مانای چی بوو؟!

برا جوتیار وتی: کاکه ئه‌و شوانه خوارزای عه‌تۆله کێ ده‌وێری بڵێ له سه‌ر دوو چاوانت (برۆ) هه‌یه؟ !

منیش به زه‌رده خه‌نه‌یه‌که‌وه وتم: خاره ئه‌و برا جوتیاره ئاقل بووه خۆی له شه‌ڕی خۆترپێن پاراستووه، وتویه‌تی سندان له ڕبه گه‌نمه‌کی بدات با عه‌تۆله‌کان دارکاریم نه‌که‌ن..؟!

خاره وتی: هاوڕێ سامان ئێستا کوردستان پڕ بووه له خوارزای عه‌تۆل، به نوێژی نیوه‌ڕۆ ماف خه‌ڵك ده‌خۆن‌و لێشت ده‌ده‌ن‌و سه‌د ناو و ناتۆره‌شت ده‌خه‌نه‌پاڵ.. ؟!

* دروونه : دروێنه

** زباره : هه‌ره‌وه‌زی

*** ده‌شکێننه‌وه : ده‌یه‌خه‌ن

## پیرە کەرێکی بێ سوود

کاتی خۆی لە گوندان هەر ماڵێك کەرێکی هەبوایە، وەك ئەوە وابوو پیکابێکی تویۆتای هەبووبێت! لەبەرئەوەی خاوەن ماڵ بە (کەر)ەکە (باراشی دەبردە ئاشی ، ئاوی لە کانی پێدە هێنا، کاروباری جوتیاریو مەڕداری پێدەکرد، بۆ سەفەری نزیكو دوور هاوڕێگای بوو، جارجارەش لە گوناهی گەورەو دوژمنداری دەیپاراستن، ......... هتد). بۆیە کوردەواری دەیانوت: (ئەوەی کەرەکی نەبی، کەرەکی ناهێنی)، بۆ ئەم مەبەستە پیاوێکی لادێنشین چووە گوندێکی نزیکیانەوە بۆ ئەوەی گوێدرێژێك بکڕێت، کە گەیشتە ماڵی کەرفرۆش خاوەن کەرەکە زۆر باسی هێزو تواناو گوێڕایەڵی کەرەکەی کرد، پیاوەی گوێدرێژکڕیش لە خۆشیان بە نرخی دیاریکراو کە دینارێك بوو ڕازی دەبێت، دوای ئەوەی کەرەکەی هێنایەوە بۆ ماڵ تێری جۆ کرد، بەیانی کورتانێکی نوێی خستە سەر پشتیو بارێکی پێ بردە (ئاش*) تا (نۆرە)ی هات کەرە نیوەی باراشی خوارد!

ڕۆژی دوایی بردی بۆ (جوتکردن)، کەچی گوێدرێژ لێی غەزریو جۆتی نەکرد!

خاوەن کەر ئەمجارەیان پیرەکەری برد بۆ (دۆڵاب**)، هەرچەندە هەچەی لە پیرەکەر دەکرد پیرەکەر گوێیەکانی شۆڕکردبۆوە، دەتوت قاچەکانیان بە (زنجیرو مێخ) لە زەویدا چەسپاندووە، بردی بۆ جەنجەڕی ماڵە جیرانەکەیان هەر چەندە کەرەی دایە بەر زەختە بێسوود بوو !

ناچار پیاوەی گوێدرێژکڕ کەرەکەی بردەوە بۆ ماڵی خاوەنی پێشووی وتی: کاکە گوێدرێژەکەتان ئەو پیاهەڵدانەی ئێوەی نەهێناو هیچ سوودی بۆ من نییە!

نە جوت دەکات، نە دۆڵاب‌و نە جەنجەڕ..!!، تەنانەت باراشەکەشی بە بێکێشە نەکرد، بەخوا برام لێم تورە مەبن کەس ئەو پیرە کەرەی بە بەلاشیش ناوێت، کەچی ئێوە بە دینارێك داوتانە بە من !

ژنەی خاوەن ماڵیش کە گوێی لە ڕاستیەکانی پیرە کەر بوو، وتییەپیاوەی کڕیاری گوێدرێژ: دەبڕۆ کاکە برۆ ئەتوو خۆ سەد دینارت بە کەرە بۆزی نەدایە، هەر کیرو گونۆکەی دینارێکی دێنی!

کە گوێم لەم وەڵامەی ژنەی خاوەن گوێدرێژ بوو، پێکەنینێ پێکەنیم هەرچی خوێنی جەستەم هەیە گەیشتە کوڵمەکانم وتم: باشە خارە ئەو ژنە بۆ تەنها ئەوێی پێ گرینگ بووە ؟!

دیارە نەبوونیەکی زۆری دیتییە!،

خارە خولە وتی: هاوڕێ سامان هەندێك بەرپرسی گەندەڵی ئەم وڵاتەش بە خۆیان‌و دارو دەستەکانیان زگ‌و بەر زگیان تێرەو قسەی گەورە گەورەش بۆ ئەم میللەتەی دەکەن! وادەزانن میللەتیش وەك ئەوان زگ‌و بەر زگی تێرە!، گومان لەوەدا نییە مرۆڤ کە زگی بەتاڵ بوو بیرکردنەوەی تەنها لە لای زگیتی‌و بەر زگ پشتگوێ دەخات !

مرۆڤی هۆشیار گەورەیی‌و جوانییەکانی مرۆڤایەتی تەنها (لەبەر زگ) بچوك ناکاتەوە.

* ئاش: ئاسیاو.

** دۆڵاب: ئاو ڕاکێشان‌و دەرهێنانی لە ئاو بیر.

## زەکات و سەرفیترەکەی مەلا خورشید

مەلا خورشید مەلای گوندی (ك، گ)ی دەشتی هەولێر بوو، پێنج فەرزە پێش نوێژی بۆ خەڵکی گوندی دەکرد، ڕۆژانی هەینی بە وتارێکی ئاینی جۆشوخرۆشی دەخستەوە دڵیان، وەك مامۆستایەکی ئاینی لە کاتی (ژن مارەکردن) بە ئەرکی خۆی هەڵدەستا، کێشەی خێزانیو دەمەقاڵەی نێوان گوندنشینانی چارەسەر دەکرد، هەر گوندنشینێك نەخۆش بکەوتایە دەچووە لایو دوعای خێری بۆ دەکرد، لە مانگی لە دایکبوونی (پێغەمبەر)و پێش خوێندنەوەی مەولود، دەیوت: خوایە گیان ئەم مەولودەمان بکەیتە (دەفعل بەلا)و ببێتە خێرو بەرەکەت بۆ هەموو دانیشتوانی گوند، هەر گوندنشینێك لە سەرەمەرگ بوایە، تا گیانی ئەسپارد (سورەتی یاسین)ی لە سەر دەخوێند، هەر پیاو و هەرزەکارێکی گوندنشین بمردبایە دەیشۆریو کفنودفنی دەکرد، سێ ڕۆژەی پرسە هاوخەمی خاوەن پرسەی دەکردو قورئانی دەخوێند، بە کورتیو بە کوردی هاوبەشی خۆشیو ناخۆشی دانیشتوانی گوند بوو !، کەچی ساڵانە لە کاتی (زەکات و سەرفیترە) گوندنشینەکانی گوندی (ك، گ) زەکاتو سەرفیترەکەیان دەبرد بۆ مەلای گوندێکیتری نزیکیان، بە بیانووی ئەوەی مەلاکەیتر خاوەنی دوو ژنو چەند منداڵێکە!

ئــه‌م خه‌مخۆرییــه‌ی گوندنشــینانی (ك، گ) بــۆ مــه‌لای گونــدێکیترو نیگه‌رانییه‌کانی مه‌لا خورشید گه‌یشتبووه لێواری پێکداهه‌لپژان!.

رۆژێکیان مه‌لا خورشید له‌گه‌ڵ چه‌ند ئیختیـارێکی گونـد لـه سـێبه‌ری دیواری مزگه‌وت دانیشتبوون، مه‌لا خورشید لـه تـاو ئـه‌و بێرێـزیو بـێ ویژدانییه‌ی خه‌ڵکی گوند، وه‌ك گونده‌ی ژه‌هرێی لێ هاتبوو، سه‌ری لـه‌و پـه‌راوێز خسـتنه‌ی خـه‌ڵکی گونـد ده‌رنــه‌ده‌کرد، لـه‌و کاتـه‌ش کـوڕێکی پارچه‌ڵه‌ی ده دوانزه ساڵی بـه هه‌شـتاوی ده‌گاتـه لایـانو ده‌ڵـێ مامۆسـتا خورشـید بـاپیرم لـه (رۆحدانـه)، بـاوکم وتـی: بێـت (یاسـینێکی له‌سـه‌ر بخوێنی).

مه‌لا خورشیدیش به تووڕه‌ییه‌وه به کوڕه پارچه‌ڵه‌که ده‌ڵێـت: بـڕۆ کاکـه بڕۆ که یه‌کێکتان لێ ده‌مرێ هه‌موو ماڵی من پێده‌زانن‌و ده‌ڵێن (قوشـه) وه‌ره (بیگێ)، وه‌خـتی زه‌کـاتو سـه‌رفیتره‌ش کـه‌س نـازانێ مـاڵی مـن لـه کوێیه!.

منـیش ئه‌وه‌نـده پێکـه‌نیم بـه وه‌ڵامـی مـه‌لا خورشـید خـه‌می ئـه‌و دوو سـاڵه‌ی نیـوه مووچـه‌م پـێ هه‌ڵڕشـت وتم: وه‌ڵـلا خـاره مـه‌لا خورشـید ناهه‌قی نه‌بووه! ئاخر ئـه‌و سـه‌رده‌مه ئه‌گـه‌ر (زه‌کـاتو سـه‌رفیتره‌ت) لـه مــه‌لا بگرتایه‌تــه‌وه‌و ئاغــاش دیوه‌خــانی لــێ قه‌ده‌غــه بکردایــه، ئــیتر مه‌لایێتی ره‌حمه‌ت نه‌بوو، به‌ڵکو زۆر زه‌حمه‌ت بوو..!

خـاره خولـه وتـی: هـاوڕێ سـامان سـاڵێکیان (کـاروان) ێکـی ده‌روێشـان گه‌یشـتنه نــاو گونــد، خــه‌ریکی (زیکـرو ته‌هلیلـه) بــوون یــه‌کێ لــه ده‌روێشه‌کان به‌ره‌و ڕووی ئه‌و مه‌لایه هات

وتی: سەرت دەبڕم‌و بە فوویەك چاكت دەكەمەوە !

مەلا خورشید ڕەنگی پەڕی‌و ڕۆح لە قەلبی نەما، هەرچۆنێ بوو خۆی لە دەستی دەروێش ڕاچلەكاند بۆ ئەوەی دەروێش بەلایەك نەنێتەوەو ئەویش نەبێتە قوربانی، پەنجەی بەر (شیر)ەكەی دەروێش كەوت‌و خوێن ڕانەدەوەستا، مەلا خورشیدیش پەنجەی بە دەروێشەكە نیشاندەداو دەیوت: ئەتوو دەت گوت سەرت دەبڕم بە فوویەك چاكت دەكەمەوە!، ئەدی ئەو خوێنەی پەنجەم بە (فوز)ی دایكت ڕاگرم ؟!

## خەڵکی گوندیو مەلای بەدبەخت

خەڵکی گوندێك له مەلایەکیان هێخستبووه ملان، وەڵڵا دەنگی خۆش نییەو قورئان بە هەڵە دەخوێنێ ! له کاتی پێش نوێژ هەڵە دەکات، تا وای لێهات کەس لە دوای مەلا نوێـژی نـەدەکرد، واتـە بـە ئەدەبـەوە بـە مەلایان وت گوندەکە بە جێبهێڵێت، لـە لایەکیـتریشـەوە خـەڵکی گونـدی لەگەڵ مەلایەکیتر پەیمانیان بە یەك دابوو هەر مەلایان ومەرنا مـاڵی ئەو مەلایە تازەیە دەهێننە ناو ئەو خانووەی کە مـاڵی مـەلای پێشووی تیابوو!

مـەلای پێشـوو خـەریکی ماڵبـارکردن بـوو، بەشـێك لـە گوندنشـینان کـە بینیان مەلا وا خەریکی ماڵبارکردنە وتیان مـەلا هەر دەڕوات دەڕوات بـا هەندێك خەمی بدەینێ!

گوندنشـینان وتیان: مامۆستا ئێمە لـە گونـدی دوو دار روبـەمان هەیـە، یەکیان گەورەیە ئەویتر بچووکە!، لە کـاتی زەکـاتو سـەرفیترەی کـە بـۆ تۆمان دەهێنا، بە دار روبە بچوکەکە گەنمەکەمان دەپێوا !

مەلاش ئاوڕێکی لێدانەوە وتی: دەبا ئەمنیش باشتان پێ بڵێم ئـەو سـێ ساڵەی من مەلای ئێوە بووم، هەر پێنـج فەرزەی نوێژ بە بـێ دەسـتنوێژ پێشنوێژیم بۆ کردوون..!!

وتم: وه‌ڵا خـاره مـه‌لا بـه‌و وه‌ڵامـه‌ی داری لـه رۆحیـداون‌و کاریگـه‌ری ده‌روونی زیاتر بووه له‌سه‌ر گوندنشینان!

خاره خولـه وتـی: هـاوڕێ سامان ئـه‌م میلله‌تـه‌ی ئێمـه هـه‌ر هه‌نـده بـه که‌سێکی گرت، خراپترین پیـاو بێـت ده‌یکـه‌ن بـه فریشـته‌و باشـترینیش بێـت ده‌یکـه‌ن بـه ژه‌هـری مـار!.. ئه‌گـه‌ر ئـه‌و وه‌سـفکردنه‌ش لـه ده‌مـی مه‌لاییێك بێته ده‌ره‌وه، ئیتر تا ته‌پری قیامه‌تێ هه‌ر وا ده‌مینێته‌وه.

## دوعای مه‌لاو زه‌فه‌ری شه‌یتان

له كۆمه‌لگای ئێمه مه‌لا به سافی وه‌ریده‌گرێ، به‌و پێیه‌ی مه‌لا پیاوی ئاینییه، له لایه‌ن هه‌ر دوو ڕه‌گه‌زه‌وه ڕێزی لێده‌گیرێت، له نێو هه‌ندێك هۆزو تیره‌و ناوچه مه‌لا پارووی ده‌كه‌وێته ڕۆنی، له پاش ئاغاو كێخوا مه‌لا به زه‌كات‌و سه‌رفتره‌ی خه‌ڵك ده‌بێته ده‌وڵه‌مه‌ندترینی گونده‌و ناوچه‌كه، كارو ئه‌ركی مه‌لا واده‌خوازێ زۆربه‌ی كات پاك‌و پۆشته‌و بۆنداربن، جگه له‌وه زمانیان لووسه‌و زوو ده‌توانن باوڕ به ئافره‌ت بهێنن!، بۆیه زۆربه‌ی مه‌لاكان به ناوی په‌یڕه‌وكردنی بنه‌مای شه‌رع له یه‌ك ژن زیاتریان هه‌یه، مه‌لای گوندێكیش ئه‌و تایبه‌تمه‌ندیانه‌ی تێدابوو، به‌شێك له ژن‌و گه‌وره كچانی گوند مه‌لایان ده‌سته‌مۆ كردبوو!، هه‌ر كاتێك پیاوه‌كانیان یان باوك‌و براكانیان ده‌چوونه جووتكردن‌و دروێنه‌و باخ ئاودان‌و شوانی، كه‌مێك گوێز، یان په‌نیرو مێوژ ، یاخود قاپێك ڕۆنی مه‌ڕ، یان خواردنیان بۆ ماڵی مه‌لا ده‌برد، ده‌یانوت: ماموۆستا ئه‌مشه‌و خه‌وێكی ناخۆشم بینیووه‌و دوعایه‌كم بۆ بكه، یان ده‌یانوت: زگمان دێشێ..!!، یاخود بروسكێك له سینگمان وه‌ستاوه، یان ده‌یانوت پشت‌و قۆڕنجمان ژان ده‌كات !، مه‌لاش ده‌ستی ده‌خسته سه‌ر شوێنه‌كه‌و دوای دوعاو فۆڵێكردنیان كار له‌كار ده‌ترازاو شه‌یتان زه‌فه‌ری پێده‌بردن!، ئه‌م كاره بێ شه‌رعییه چه‌ند ساڵێك به‌رده‌وام بوو، تا ڕۆژێكیان مه‌لا ژن به‌سه‌ر ڕوداوێكیاندا ده‌چێت!، ئیتر مه‌لا شه‌رمه‌زار

دەبێت‌و بڕیار دەدا گوند جێبهێڵێ، خەڵکی گوند زۆر دلگران بوون، بەڵام مەلا بڕیاری خۆی دابوو،پێش ڕۆیشتنی بە خەڵکی گوندی وت: گەردەنم ئازا کەن دەزانم پاش ڕۆیشتنی من خورە خورەك لە گوندی پەیدا دەبێت ! بەڵام ئێوە بە قسەی شەیتان مەکەن!

منیش زۆر پێکەنیم وتم: خارە خولە هەندێك مەلای دەنگ خۆش هەیە ئێستاش بە سافی وەریدەگرن، بە تایبەتی لە پرسەی دەوڵەمەندەکان، یان بەرپرسەکان، چونکە بۆ هەر پرسەیەك بانگی بکەن پێشوەختە پێیان دەڵێت ئەوەندە وەرەقە دۆلارەم دەوێ! لەوەش سەیرتر لە کاتی پرسە مەلای ژنیش پەیدا بووینە، بۆ قورئان خوێندن و مەولود خوێندنەوە لە نێو ژنان ئەویش لە پێنج سەد بۆ هەزار دۆلاری دەوێ! سەیرەکەش لەوەدایە مەولود خوێندنەوەکانی ئەو مەلا ژنانە لەسەر ئاوازی گۆرانییە شادییە کوردییەکانە، دەبێت سەرچۆپی بگریت! خارە خولە هەر لە سەر بەزمی مەلایان هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە کە خاڵی دایکی مەلایە ئەوانیش بە نیازی مارەکردنی کچێك بۆ براکەیان پێیان باش بووە مەلای خزمیان وەك پیاو ماقووڵ‌و هەم بۆ مارەکردنەکەش لەگەڵیان بێت، دوای مارەبڕین برا گەورەکەیان سەد هەزاری داوەتە مەلای خزمیان، کەچی مەلا پێی وتوونە بۆ ئەو جۆرە خێرانە لە سەد دۆلار کەمتری وەرنەگرتووە ! خزمەکانیان بە مەلایان وتووە: مامۆستا فەرقێکی وای نییە وەریگرە!، کەچی مەلا دەیوت: با با بیست‌و هەشت هەزار دیناری فەرقە..!!، ئەی باشە خارە خولە ئەوە بۆ ناڵێیت گەنج هەیە دەچێتە خوازبێنی دە دوانزە کچ لەبەر مەرجە

قورسەکانیان لە زێڕو ماڵی سەربەخۆ دەستیان لێ هەڵدەگرێ!، کەچی مەلا ژنی یەکەمی ڕازی دەکات کە بە قسمەتی ژنی دووەم ڕازی بێت، پاشان یەکەمو دووەمیش ڕازی دەکات بۆ ئەوەی دەسپێشخەرو کار ئاسانی بۆ بکەن لە پەیڕەوکردنی شەرع کە چوار ژنە!، وەڵلا خارە ئەوەی لۆ مەلای هەڵدەکەوێ بۆ ئێمەمانان هەڵناکەوێ!، بەڵام پێم بڵێ توانجە سیاسییەکەت لەسەر ئەم سەرگوزەشتەیە چییە؟!

خارە وتی: لە کوردستانیش تازە لە لای هەندێك حزبی بە ناو ئۆپۆزسیۆن خورە خورەك پەیدا بووە دەڵێن: شکستی شانزەی ئۆکتۆبەر شکستی (یەکێتیو پارتی)یەو بە قازانجی گەلی کورد تەواو دەبێت!، لە کاتێکدا زیاتر لە نیوەی خاکی کوردستان کەوتەوە ژێر پۆستاڵی ڕەشی عەرەبە شۆڤێنییەکان!، بەدبەختییەکەی کورد لەوەدایە پەند لە هەڵەکانی ڕابردووی وەرناگرێت!.. چی نەما بۆ ئێرانو تورکیای نەکەن! دوای رووخانی بەعس چەند حکومەت لە عێراق دروست بوونە، هەر هەموویان بە پاڵپشتیو هاوپەیمانێتی کورد بووە!.. لە شەڕی داعش نزیکەی دوو هەزار پێشمەرگە شەهیدبوونو دە هەزاریتریش برینداروو کەمئەندام بوون!، کەچی ئێستا هەندێك بە ناو رۆشنبیرو سیاسی تەنها بۆ ئەوەی پشتی براکەی بشکێنێت، عەبادی دەکاتە فریشتە!، هەزار رەحمەت لە گۆڕت کاوێس ئاغا باشی بۆچووە کە دەڵێت: (کورد خائینۆ).

## به دوعا بێت

هەرزەکارێکی گوندنشین بۆ خۆشی خۆی‌و بینینی هەولێرو پیرە قەلات سواری پەستی گوندی دەبێت‌و لەگەڵ چەند ژن‌و پیاوێکدا دەگەنە هەولێر، ژن‌و پیاوەکان بۆ کڕینی پێداویستی روو دەکەنە دووکانەکان، کوڕە گەنجەکەش دەچێتە سەر قەلات، ئەو کاتە بەشێك لە منداڵە شەڕاوییەکانی قەلاتیش وەك گروپ لە نێو قەلا دەسووڕانەوە، هەر منداڵیکی غەیری قەلاتییان بدیتایە شەڕیان پێدەفرۆشت، کاتێك چاویان بە کوڕە هەرزەکارە دەشتەکییەکە دەکەوێت وەك کەمتیار چوار دەوری دەگرن، یەکێ بە دار، یەکێك بە شاپ، یەکیتر بە مست وەردەگەڕێنە کوڕە هەرزەکارەکە، هەر چۆنێ بێت کوڕەی گوندی خۆی دەگەیەنێتەوە خوار قەلا، دەم نا دەمێ لە ترسان‌و لە داخان ئاوڕێك لە قەلات دەداتەوەو دەڵێت: بەو غەوسەی مار لە بەغدایێ لەسەرتان ناچی.

منیش وتم: وەڵلا خارە بەشێکی زۆر لە نووسەران‌و پیاوە بە تەمەنەکان باسی ئەو ناکۆکییەی نێوان منداڵە قەلاتی‌و گەڕەکەکانی شاری‌و گوندییان کردووە ! بەلام تۆ مەبەستت لەمە چی بوو؟

خارە خولە وتی: کەسی خارەی هەزار قولوەڵلا ناکاتە مراکە ڕوونەك!، ئەتوو ئەگەر بە دەستوقامی خۆت هیچت نەکرد، بە دوعا چ ناگری!..

میللەتی ئێمەش لەو هەمووە نا عەدالەتییەی لە شوێنی هەڵوێست هەر دوعا دەکەن.

## پوره فاتم و دوعا

پوره فاتم هەر لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە سەری بچووبا نوێژی نەدەچوو!، جگە لە مانگی رەمەزانو شەش رۆژەکەی (شەشەران) هەموو هەفتەیەك رۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە بە رۆژوو دەبوو، گەرمای هاوینو سەرمای زستانو داواکاری شەرعی پیاوەکەی چۆکیان پێدانەدەدا، پووره فاتم تەمەنی گەیشتبووە نۆهەت ساڵی، کەچی ماوەی چەند مانگێك وازی لە نوێژەکان هێنا!، خزمانی پێی دەڵێن پورە فاتم تۆ بە چلەی هاوین بە رۆژوو دەبوویت، لە دوای سەپانان (گیشە کێشیت) دەکرد، کەچی وازت لە نوێژو رۆژو نەدەهێنا، بۆچی ئێستا نوێژەکانت ناکەیت !، پورە فاتم دەڵێت: رۆڵەکانم گەلەکم کردییە!، کەچی دوعایەکی لە (جەبار) سەر خڕی دەکەم گیرنابێت!.

منیش بە زەردەخەنەیەکەوە وتم: خارە دیارە جەبار سەرخڕ (زۆر عالۆری) بووەو پورە فاتمیش هەموو کات دەست بە دەستنوێژ بووە؟
خارە خولە وتی: هاوڕێ سامان ئەوە دەق حزبی ئێمەیە هەشتا ساڵە دەست بە دەستنوێژین، کەچی ئەو میللەتە هەر لە پاکیو باشی ئێمە ناگەن..!!

## شوفێری و گاڵتەوگەپی ئافرەتە سەرنشینەکان

سێ ئافرەت بە نیازی سەفەرکردن لە شارەکەی خۆیان بۆ شارێکیتر بەرەو گەراجی گواستنەوە بەڕێکەوتن، کە گەیشتنە نەقلیات بە شوفێرەکانیان وت: ئێمە سێ نەفەرین ئۆتۆمبیلێکی تایبەتمان دەوێت. شوفێرەکانیش هەر بۆ گاڵتەوگەپی نێوان خۆیان وتیانە ئافرەتەکان: سڕەی کەڕەیە!، بڕۆن سەرکەونە نێو ئەو ئۆتۆمبیلە سوپەرکراونەی! ئافرەتەکانیش وا تێگەیشتن کە شوفێرەکە (کەڕە) واتە گوێبیستی قسە نابێت!، هەر سێ ئافرەتەکە لە دواوەی ئۆتۆمبیلەکە دانیشتن و کاکەی شوفێر لێیخوڕی، ئافرەتەکان لە ڕێگا بە ئارەزووی دڵیان باسی ساتە خۆشەکانی تەمەنی خۆیان دەکرد، لەگەڵ دڵدارەکانیان و شەوی ناو جێگا لەگەڵ پیاوەکانیان، یەکێك لە ئافرەتەکان کە لە دەستی ڕاستی دواوەی ئۆتۆمبیلەکە واتە لای سەکن دانیشتبوو کەرێکی نێرەکەری بینی لە بن زگی خۆی دەدایەوە بە گاڵتەوە بە ئافرەتەکەی پشت شوفێرەکەی وت: سەیری ئەو گوێدرێژە بکە هەی بەوەی ئەو بتدڕێنم ! ئیتر هەرسێکیان دایانە قاقای پێکەنین!.

ئەمجارە ئافرەتەکەی پشت شوفێرەکە بە ئافرەتەکەی لای دەستە ڕاستی وت: تۆ ڕەش ئەسمەرو قەڵەوی بەرگەی ئەمە دەگری!

چەند جارێك بەم جۆرە قسانە دڵی یەكتریان خۆشكرد! ئافرەتەكەی ناوەڕاستیان بۆنەوەی گاڵتەوگەپی نێوان هاوڕێكانی ڕاگریَ وتی: كچینە نە بە هی تۆ، نە بە هی ئەو، با بە قوونی شوفێرەكە بێت!
شوفێرەكە كە گوێی لەم جوێنە بوو، ئاوڕێكی لێدانەوەو وتی: لەوەتەی سەركەوتوونەتە ناو ئۆتۆمبیلەكەم باسی عەرش‌و قوڕشتان كرد كیرو گونی دنیاییێتان هێنایە گۆڕێ! ئەمن خۆم لێ كەڕ كردبوون! شەیتان دەرێ ببە نێرەكەرو بە ناویان بكەوە!
ئافرەتێكیان قسەكەی كاكەی شوفێری پێخۆش بوو وتی: وەڵڵا باشە جار جارەش بە گوێی شەیتان بكەیت!

منیش دامە قاقای پێكەنین وتم: وەڵڵا كاكەی شوفێر پارووی كەوتۆتە روونیێ!، ئەومیە دەڵێن كەس نازانێ خێر لە چیدایە!.. بەداخەوە یەكێ لە نەریتە خراپەكانی كورد ئەومیە زۆر حەزیان لە ناو و ناتۆرەلێنانی یەكترن!، بەڵام ئەم ناولێنانە بۆ كاكەی شوفێر خێرو بەرەكەت بووە!، ئەی باشە خارە توانجەكەی تۆ چییە لەسەر ئەم بەزمە؟!
خارە خولە: وتی هاوڕێ سامان ئەم كاربەدەستانەی حكومەتی ئێمەش بە خۆ بە ماڵ‌و منداڵیان لەبەر رابواردن‌و كەیف‌و سەفای خۆیان گوێیان كەڕكردووە لە ئاست داوا ڕەواكانی خەڵك!، بۆیە باشە جارجارێ میللەتیش بە گوێی شەیتان بكات‌و لێیان بێنە مەیدان!

## هاوسەرگیری زاوایەکی بەدبەخت

پیاوێك دوای کارکردنو ماندووبوونێکی زۆر کەمێك پارەی کۆکردەوە، بڕیاریدا بە پارەکە ژن بێنێ، دوای خوازبێنیو ڕازی بوونی کچەو بنەماڵەی کچە ڕۆژی مارەبڕینو ئاهەنگی گواستنەوە دیاری کرا، دوای نانخواردنو ئاهەنگ، بووكو زاوا چوونە ژووری خەوتن، نەریتی کۆن ئاوا بوو، تا کوڕە بە زاوا دەبوو، کەسوکاری زاوا لە بەردەم ژووری بووكو زاوا ڕادەوەستان! دوای تەواوبوونی کاری ژنو مێردایەتی زاوا لە ژوورەوە دەهاتە دەرەوەو خۆی یان کەسوکاری دوو سێ گوللەیان دەتەقاند، ئەمەش مانای بە زاوابوونی دەگەیاند، دوای هاتنەدەرەوەی زاواش دایکیو پورەکانیشی دەچوون سەیرێکی پەڕۆی سپی ژێر بووکەیان دەکرد!، زاوای بەدبەخت کە چووە لای بووکەخان بینی بووکە خۆی دۆڕاندووەو لە کچێتی کەوتووە ! زاوا کە هەستی بەمە کرد، وتییە بووکەخان: هۆپ..!

بووکەخانیش وتییە زاوا:

هۆپت بە هۆپێ

چاوی چەپەت بقۆپێ

لە قەرەقاجی ئەرمەوانێ

لە کوڕە کوڕێ کۆییان

هەر ئەوەندەشت لۆ مایتەوە!

## شووكردنەوە

پیرێـژنێكی تەمـەن شەست ساڵان بـانگی كوڕەكـانی كـردو پێـی وتـن: دەمەوێ لێفەی خۆم نوێ بكەمەوە !

كوڕەكانیش لە مەبەستی نەگەیشتن وتیان: دایكە تـۆ تاقـەتت نییـە، با ژنەكانی ئێمە لێفەكەت بـۆ نـوێ بكەنـەوە ! دایكیـان زانـی كوڕەكـان لـە مەبەستی نەگەیشتن، وتـی: كوڕم مـن دەمـەوێ ئەوەنـدە تەمەنـەی كـە ماوەمە لەگەڵ كەسێك بیبەمە سەر، بۆ ئەوەی بە شەو و ڕۆژ ئاگامان لـە یەك بێت !

كوڕەكان وتیان: ئاخر دایكە تۆ تەمەنت شەست ساڵە!

دایكیان وتی: كوڕم شـەرعەن هـەقی خۆمـە، دە سـاڵە باوكتـان مـردووە! ئێوەش پیاوێكی تەمەن شەست ساڵەی هاوتەمەنی خۆم بۆ بدۆزنەوە !.

كوڕەكانی چونە لای مەلاو داواو نیازی داكیان بۆ باس كرد، مەلاش پێی ڕاگەیانـدن كـە بـە گـوێرەی شـەرع داكتـان مـافی خۆیـەتی و جـاهزە، كوڕەكـان دوای گـەڕانو سـووڕان هاتنـەوە لای دایكیـانو وتیـان: هـەموو ناوچەكەمان گەڕاین كەسێكی تەمەن شەست ساڵانەمان نەدۆزییەوە كـە ئامادەبێت ژنبێنێ!

دایكی پێی وتن: دەنا بڕۆن دوو پیاوی تەمـەن سـی ساڵە بهێـنن دەكاتـە شەست!

منـــیش وتم: خـــارە خولـــە دیـــارە دایـــە حـــاجی نەبوونییـــەکی زۆری بینیووەو لە هێسکی کاری کردووە؟

خارە خولە وتی: هاورێ سامان ئەدی نالێن بە دوو ژنان شاهێدێکن! دایـە حـاجیش دەیویسـت بڵـێ لـە رۆژی تەنگانـەش بـە دوو پیـاوان پیاوێکن..!.

## ئەسیری و دوو مێردی

لە شەری نێوان ئێراق و ئێران سەربازێکی کوردی عێراق بە ناوی (حەمەد) بە دیل دەگیرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ نامەو زانیارییەکی ناگاتەوە ماڵەومیان، ماوەی حەوت ساڵ ئەو سەربازە ئەسیرە کوردەی باشوور بە (ونبوو، مفقود) لە قەڵەم دەدرێت، دوای چوار ساڵ لەو بێ سەرو شوێنییەی (حەمەد)، دایكو باوكی ( حەمەد ) و دایكو باوكی خێزانەکەی و خزمانیان دڵنەوایی ژنەی (حەمەد) دەدەنەوەو پێی دەڵێن: تۆ ئافرەتێکی جوان و ناسکی و تەنها یەك منداڵت هەیە، وا باشە بە سەر بڵندی (شوو) بکەیتەوە، ژنە کەمێك خۆی گران دەکات و دەڵێ لە دوای (حەمەد) مێرد کردن لە من حەرام بێت، هەر چۆنێ بێت خزمانیان ڕازی دەکەن کە شوو بکاتەوە، ئەویش لە هەمان گوندی خۆیان مێرد بە پیاوێك دەکاتەوە، بە ناوی (عەزیز) دوای ڕاوەستانی شەڕی (عێراق و ئێران) ڕۆژێکیان لە گوند دەبێتە بەزمو خۆشی و هەلهەلە لێدان کە (حەمەد) گەڕاوەتەوە گوند، کە ئەم هەواڵە دەگاتە (زرێخ) دەڵێ: وەڵڵا دڵم (حەمەد)ی دەوێ و زگیشم بە (عەزیز)ی دەسووتێ.

منیش زەردەخەنەیەکم کرد وتم: خارە ئەوە ڕەنگە برینی شەوانی کولابێتەوە؟!

خارە خولە وتی: هاوڕێ سامان (زرێخ)یش وەك برادەرانی یەکێتی لێهاتووە، لە لایەك دڵیان لە گەڵ برادەرانی بزووتنەوەی گۆڕانەو لە لایەکیتریش بە بێ حکومەت و بە بێ هاوپەیمانێتی پارتی ناتوانن.

## گفتوگۆی دایك و كچێك

ژنانی گوند بەرێكەوتن بۆ سەر كانی ژنان بۆ ئەوەی خۆیان و جلوبەرگی ماڵەوە بشۆن، كە گەیشتنە سەر كانی، یەكێ لە ژنەكان كە بوخچەكەی كردەوە بۆ ئەوەی جلەكان بشوات، بینی سابوونی جل شووشتنی لە ماڵ لە بیركردووە!، وتییە كچەكەی كوا سابوونەكەی كۆری؟، كچەكە وتییە دایكی دیارە لە ماڵ لە بیركراوە من وا بە پەلە دەچمەوە ماڵ دەیهێنم!، كچە كە گەڕایەوە لە رێگا بینی (نێرەكەر) ێك لە خۆشی ئەوەی لە نێو گیاو قەرسیلان تێری خواردبوو هەرامەی لەبەر زگی دەخشان! كچەكە هەر جارێك دەیبینی كەرەكە لە بن سكی خۆی دەخشاند، دەیوت: هەی بە ژوورم، هەی بە ژوورم! كە گەیشتەوە سەر كانی ژنان دایكی لێی پرسی: بۆچی ئاوا دواكەوتی؟ ئەویش بۆ دایكی گێڕایەوە كە هەتا (هەرامەی كەرەكە) پوچ بۆتەوە هەر جارێ لە بن زگی خشاندووە ئەو وتویەتی هەی بە ژوورم !

دایكی وتی: دەڵێن هەتا دێت دنیا خراپترو بەشەر بێ رۆحمتر دەبێت ! بزانە قەت جارەكی بە دەوتدا هات بڵێی هەی بە ژووری دایكم !

منیش زۆر پێكەنیم و وتم: خارە ئەوەیە دەڵێت هی خۆم لۆ خۆم، هی تۆش دەخۆم!.. دایكی كچە هی باوكی كچەی تاپۆكردییەو چاوی بەو سەیركردنەی كچەكەشی هەر نەهاتووە؟!

خارە خولە وتی: بە راستی ئێستا وای لێهاتووە هەر كەسەو بە دوای خۆشییەكانی خۆی كەوتووە، وەك دەڵێن برا ئاگای لە برای نەماوە، خەڵك هەیە لەو شارەی لەسەر پارەی دەخەوێت! براو خوشك و دایك و باوكیشی خەڵك خێریان پێ دەكات!.

## زێڕی ژنەو تەکسی

پیاوێك داوای لە ژنەکەی کرد زێڕەکانی بداتێ بۆ ئەوەی بیانفرۆشێو ئۆتۆمبیلێکی تەکسی پێ بکڕێت، وەك پیاوی خەڵکی خەریکی کارو کاسبی بێت !

ژنەکەی دڵی نەدەهات زێڕەکانی بفرۆشێت، ناچار بە توڕەییەوە بە پیاوەکەی دەوت: ئەتوو شوفێری نازانی!، ئەگەر بەیانی تووشی ڕووداوێکی هاتووچۆ هاتیت؟! ئەگەر لە منداڵێکتدا؟! ئەگەر ئۆتۆمبیلەکە مەکینەی سووتا، ئەوا سەرو ماڵمان دەڕوات!، ژنە بۆ ئەوەی زێڕەکان نەداتە پیاوەکەی قسەی بە قسەی وەدەناو دەیوت: ئەدی نالێن ئەگەر پیاو هەبێت شەوی تاریك زۆرە! دەبڕۆ لۆ خۆت وەکو پیاوی خەڵکی کرێکاری بکە، هەر قازانج دەکەیتو هیچ زەرەر ناکەیت!

چەند ڕۆژێك بەسەر ئەو گفتوگۆیەی نێوانیاندا ڕۆیشت، شەوێکیان پیاوەو ژنە سەر گەرمی چێژوەرگرتن بوون لە یەکتری پیاوەکە وتی: ژنێ ئەمڕۆ بە تەمابووم (هەرامەکەم، ئەندامی نێرینەم) بگۆڕمەوە لەگەڵ هی پیاوەکیتر، بەڵام لەبەر ئەوەی هی پیاوەکەیتر (ئینجێك) لەوەی من گەورەتر بوو پارەی لەسەر دەویست!

ژنەکە وتی: بەیانی زێڕەکە ببە بیفرۆشەو هەتا پیاوەکە پەشیمان نەبۆتەوە سەودایەکە بکە!

پیاوەکە وتی: ژنێ لۆ نانـەکی حـەڵاڵ ئاڵتونەکـەت نەفرۆشـت، بـەس لـۆ ئینجێك گەورەتر دادو فیغانتە !

منـیش زۆر پێکـەنیمو وتم: خـارە خولـە دەڵـێن پیاوێـك لەسـەربانی خانووەکـــەیان دەکەوێتـــە خـــوارەوەو بـــە بـــێ هۆشـــی دەیگەیێننـــە نەخۆشخانە، دوای پشکنین پزیشك وتی: شـوکر سـەرو پشـتی زۆر باشـە تەنها حەوزی شکاوە!، ژنـی پیاوەکـەش دەیـوت: کێشـەمان حـەوز نییـە، هەر بەلوعەگەی نەشکێ!
خارە خولەش زۆر پێکەنی وتی: ئەو بەلوعەیـە خـۆ کەلوپـەلی (سـینی) نییە قەت ناشکێ.

## بێ شەرمی کوڕان و ژیری کچان

مـاڵێکی مـەڕدار لـە کۆتـایی وەرزی زسـتان (گاوکۆت*)یـان لێ بـڕاو مەڕەکانیان لە برسان لە نێو (هۆڕ**)ی بارەبارِیـان بـوو !، ژنـی خـاوەن ماڵەکەش بە کچە جەحێلەکەی وت: بڕۆ دوو (گـووش***) کـاوکۆت لـە مـاڵی پلکـە (هـەمین)ی بێنـەو بڵـێ تـا بـاوکم لـە سـەفەر دێتـەوە بۆتـان دەگرِینەوە!

کچەش چوو لە دەرگای ماڵی باجی (هەمین)ی دا، کوڕێکی هەرزەکاری جـوانی پلکـە (هـەمین) دەرگـای کـردەوە، کچـەکە سـڵاوێکی لـە کـوڕە گەنجەکە کردو وتی: دایکم دەڵێ دوو تەلیس کامان بدەنێ تا دەگەینە بەهارێ.

کوڕەش وتییە کچەکە: تا دوو ماچم نەدەیێ یەك مشتە کات نادەمێ!

کچە گەڕایەوە ماڵـەوە شـەرمی کـرد بـە دایکی بڵـێ کـە کوڕەکـەی پلکـە هەمین داوایەکی ئاوای لێکردووە!

وتی: دایە گیان ماڵی باجی هەمینیش وتیان کاوکۆتمان نەماوە!

چـەند رۆژێکـی پێچـوو بـەفر توایـەوەو سـەوزاییو وەرزی بـەهار هـات، کچە لە حەسارێ خەریکی مانگا دۆشین بوو، کوڕەکەی پلکـە هـەمینیش بەرەو مزگەت شۆڕدەبۆوە، گوێی لە دەنگی کچەی هاوسێیان بوو کـە بـە دەنگێکی بەرز لە کاتی چێر دۆشینا دەیوت:

ئەرێ دایێ ئەرێ دایێ

ماچم نەدا بە تەلیسە کایێ

پیاوێ بێ ئه‌قڵ بێ
وا ده‌زانی به‌هار نایێ

منیش وتم: وه‌ڵڵا خاره کچێکی ژیرو روو سپی بووه! ئابرووی خۆی‌و خانه‌واده‌که‌ی پاراستووه!
خاره خوله وتی: هاوڕێ سامان له‌گه‌ڵ رێزم بۆ ئافره‌تی ئێستا به‌شێکیان نه‌ك هه‌ر به دوو ماچ به گه‌ڕان‌و سووڕانی ناو پارك‌و چێشتخانه‌کانیش داناگه‌سێن! بۆیه هه‌موو جارێ ده‌ڵێم: (ژنی پێشان، پیاوی پێشان، حاجی پێشان، مه‌لای پێشان، قاوه‌ی پێشان، چایه‌ی پێشان، له‌حیمی پێشان، حزبی پێشان‌و ..تاد. ئه‌وانه هه‌موو ئه‌سڵی بوون.

* کاوکۆت: نالیك ، پوشی کوتراو هه‌ڵگیراو .
** هۆر: کۆز، ئه‌و شوێنه‌ی مه‌ڕو مالآت تیایدا ده‌خه‌ون وه‌ك (هۆڵ) یکی گه‌وره وایه.
*** گووش: گونیه, ته‌لیس .

## دزێکی بە ئەزموون و گەردەلوول

دزێکی بە ئەزموون هەر کاتێک لە دزییەک ئاشکرا ببوایە بە زمانلووسی و زانایی خۆی، خۆی لە کارو تاوانەکە بێ ئاگا دەکرد!، ڕۆژێکیان کاکەی دز چوو بووە نێو باخ و بێستانی پیاوێک تا بۆی کرا میوەی خوارد، لە دواییدا (گوش)ێکی پڕ لە میوە کرد!

لەم کاتەدا خاوەن باخەکە ڕوو بە ڕووی کابرای دز وەستا..!

گوتی: کاکە ئەوە چ دەکەی لێرە؟

کاکەی دز بە خاوەن باخەکەی وت: ئەی تۆ چی دەکەیت لێرە؟

خاوەن باخ گوتی: کاکە گیان من خاوەنی ئەم باخەم!

کاکەی دز کە زانی تێکەوتووە گوتی: زۆر شوکر بۆ خودا بەو خەمەوە سەرم نەنایەوەو نەمردم، برا گیان لە ناچاری و لە برسان چەند میوەیەکی ئەم باخەی تۆم خوارد، تو گەورەیی خودا گەردنم ئازاکە!

خاوەن باخ پێی گوت: برام گەردنت خۆش و ئازا بێت، بەڵام تۆ لە کوێوە هاتووی و چۆن ڕێت کەوتە ناو باخەکەی من؟

کاکەی دز گوتی: وەڵا قوربان من خەڵکی ئەو خوارەوەم لەبەر دەرگایماڵەوەمان ڕاوەستا بووم گەردەلوولێکی بەهێز هەڵیکردو ئەوەندەم زانی کەوتوومەتە ناو باخەکەی جەنابتان!

خاوەن باخەکە گوتی: ئێ باشە ئەو هەموو لقە دارە چۆن شکاومەتەوە؟

كاكه‌ی دز گوتی: قوربان گه‌رده‌لوولەكه چه‌ند جارێـك بـه‌ملاو به‌ولايـدا دام، خه‌ريك بوو ئه‌م لقه دارانه بچێته چاوم!
خاوه‌ن باخ گوتی: شوكور بۆ خوا كۆره نه‌بووی!، ئه‌دی باشه ئه‌و هه‌موو ميوه جۆراوجۆرانه چۆن خراوه‌ته ناو ئه‌م گووشه‌وه؟
كاكه‌ی دز گوتی: وه‌ڵا قوربان منيش له‌وه‌يان سه‌رم سوورماوه !

خاره له كورده‌واری ده‌ڵێن: (په‌تی درۆ كورته)، بـه‌ڵام جگـه لـه كاڵفامی باخـه‌وان‌و ديـاره ئـه‌وه دزێكـی مـه‌علان بـووه، بـه زمانلووسـی خـۆيی ڕزگاری كردوه ! باشه توانجه‌كه‌ت چييه له سه‌ر ئه‌م سه‌ربوده‌يه؟
خـاره خولـه وتـی: هـاوڕێ سـامان ئه‌مـه‌ش وه‌ك نـه‌وت فرۆشـتنه‌كه‌ی كوردستانه، به دزی‌و به ئاشكرا نه‌وت ده‌فرۆشرێ!
وڵاتانی ده‌روجيران پێمان خه‌نی بووينه!
كه‌چی ميلله‌ت وه‌ك باخه‌وانه‌كه سه‌ری لێشێواوه، كه‌س نالێ پاره‌كه‌ی وا له خه‌زينه‌ی منه.

## هه‌ژاری‌و سه‌ربه‌رزی

خێزانێکی هه‌ژاری نۆ که‌سی، ڕۆژ به‌ ڕۆژ زه‌حمه‌تییه‌کانی ژیان ماندووتری ده‌کردن، دایکی منداڵه‌کان وتییه‌ باوکی منداڵه‌کان: بڕۆ لای فلانه‌ ده‌وڵه‌مه‌ندی شارو به‌ ڕاستگۆیی‌و به‌ بێ زیادو که‌م باسی ژیان‌و گوزه‌رانی خۆمانی بۆ بکه‌، به‌ڵکو ویژدانی بجووڵێ‌و هه‌ستی ویژدان وای لێده‌کات هه‌ندێك پاره‌مان به‌ قه‌رز بداتێ!، تۆش وه‌ك پیاوی خه‌ڵکی کارو کاسبییه‌کی حه‌ڵاڵ بکه‌و سه‌بر سه‌برەش پاره‌ قه‌رزه‌که‌ بده‌وه‌!

باوکی منداڵه‌کانیش له‌به‌ر زه‌حمه‌تییه‌کانی ژیانیان، به‌ ناچاری ئامۆژگارییه‌کانی ژنه‌که‌ی له‌به‌رچاوگرت‌و به‌ شه‌رمه‌وه‌ ڕووی له‌ ماڵی زه‌نگینێکی شار کردو به‌ بێ زیادو که‌م باسی ژیانی خۆیانی کرد، پاشان وتییه‌ ده‌وڵه‌مه‌نده‌که‌: هاتووم هه‌ندێك پاره‌م به‌ قه‌رز بده‌یتێ.

پیاوه‌ی زه‌نگین به‌ پیاوه‌ی هه‌ژاری وت: کێشه‌ نییه‌، به‌ڵام خزمێکت بێنه‌ ببێته‌ (که‌فیل‌و شاهید) پیاوه‌ی هه‌ژار وتییه‌ پیاوه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ند: قوربان ئه‌گه‌ر من خزمێکی ئاوا خه‌مخۆرم هه‌بوایه‌، ئێستا نه‌ده‌هاتمه‌ به‌ر ده‌رگاتان!، بۆیه‌ که‌سی ئاوا شك نابه‌م له‌م ڕۆژه‌ڕه‌شه‌ ببێته‌ که‌فیلم!، به‌ڵام به‌ڵێنت پێ ده‌ده‌م به‌ بێ کێشه‌ قه‌رزه‌که‌ت بده‌مه‌وه‌!.

پیاوه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ند بۆ تاقیکردنه‌وه‌ی پیاوه‌ی هه‌ژار وتی: ته‌ڵێك له‌ سمێڵتم بۆ لێکه‌وه‌و من وه‌ك به‌ڵگه‌یه‌ك ده‌یخه‌مه‌ ناو ئه‌م قوتووه‌!.

پیاوه‌ی هه‌ژار وتی: قوربان ئه‌گه‌ر پاره‌که‌م به‌ خۆڕایش بده‌یتێ، یه‌ك داو له‌ سمێڵم لێناکه‌مه‌وه‌!.

پیاوه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ند كه گوێی له‌م وه‌ڵامه بوو له دڵی خۆیدا وتی: ئـه‌وه كلاوچی‌و پاره‌خۆر نییه‌!، بۆیه پـاره‌ی پێویسـتی دایـه هه‌ژاره‌كـه‌و وتـی: ئه‌گه‌ر هه‌تبوو بمده‌وه، ئه‌گه‌ر نه‌شتبوو گه‌ردمنت ئازا بێت!

پیاوه‌ی هه‌ژار سوپاسی كردو به پاره‌كه‌ی ڕۆژو شـه‌و خـه‌ریكی كـاركردن بـــوو، دوای كـــه‌متر لـــه ســـاڵێك پـــاره قه‌رزه‌كـــه‌ی دایـــه‌وه پیـــاوه ده‌وڵه‌مه‌نده‌كـه‌و دووبـاره سوپاسـی كـرده‌وه، بـه پـاره قازانجه‌كـه‌ش خه‌ریكی كارو ژیانی خۆیان بوو!.

پیاوه‌ی هه‌ژار ژیانی كـه‌مێك ئاسـایی بـۆوه‌و لـه برسـیه‌تی ڕزگـاری بـوو، به‌ڵام كه‌وته سه‌ر زاری خه‌ڵكی گه‌ڕه‌ك، پاره‌ی له كوێ بوو؟!، كێ بـاوڕی به‌و هه‌ژاره بووه‌و پاره‌ی داوه‌تێ؟! چۆن ئاوا قازانجی كرد؟!

خه‌ڵكه‌ك كه زانییان فلانه ده‌وڵه‌مه‌ندی شار پاره‌ی به قه‌رزو بـێ زیـاده خستنه‌سه‌ر داوه‌ته پیاوه‌ی هه‌ژار!

پیاوێكیتری گه‌ڕه‌ك ژیـانێكی ئاسـایی ده‌ژیـا، بـه‌ڵام بـۆ هـه‌مان مه‌به‌سـت چووه لای پیاوه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ندو داوای قه‌رزی لێكرد !

پیـاوه‌ی زه‌نگینـیش بـه هـه‌مان شـێوه‌ی پیـاوه‌ی هـه‌ژار داوای كـه‌فیل‌و شاهیدی كرد!

پیاوه‌كه وتی نیمه !

پیـاوه‌ی زه‌نگین وتـی: تـه‌ڵێ لـه سمێڵـتم بـۆ لێكـه‌وه، وه‌ك بـه‌ڵگه هـه‌ڵی ده‌گرم!

پیاوه‌كـه وتـی: قوربـان حـه‌ز ده‌كـه‌ی نیـوه‌ی سمێڵمـت داو بـۆ لێده‌كه‌مه‌وه!

پیاوەی دەوڵەمەند کە گوێی لەم وەڵامە بوو لەوە دڵنیابوو پارەکەی دەفەوتێ!
بۆیە بە هەر شێوەیەك بووخۆی لێ ڕزگار کردو قەرزی نەدایێ !

منیش وتم خارە پێش ئەوەی گوێم لە توانجەکەت بێت، خزمێکی نزیکمان زۆر دەوڵەمەند بوو لە ساڵی ۱۹۹۲ دایکم چووە لای بۆ ئەوەی کەمێك پارەمان بە قەرز بداتێ بۆ چەند مانگێك.
خزمەکەمان وتی: پارەی وشکەم نییەو هەموو لە ناو کارەدا، پاشان لە لای خزمێکمان وتبووی چۆن پارەیان بدەمێ!
نە دوکانێکیان هەیە لە قازانج بمدەنەوە!.. نە ئۆتۆمبیلێکیان هەیەو بەیانی بیفرۆشن‌و بمدەنەوە..! کەچی ڕۆژگارێك هات ئەو خزمەمان نانی نەبوو بیخوات!
پاشان وتم: خارە خولە توانجەکەت چییە؟
وتی: کەسی خارەی لەم ڕۆژگارە کەسانێك هەن نەك ڕێز لە سمێڵی ناگرێ!، بەڵکو ڕێز لە کەسایەتی‌و بیرو باوەڕەکەشی ناگرێ‌و بە چەند وەنەوشەو پارچە زەوییەك دەیفرۆشێ!، لەوەش سەیرتر ئەومیە سمێڵی دەڵێی باڵندەی (باران بڕە)یەو بە ناوی تیرەو عەشیرەت ئەم حزب‌و ئەو حزب دەکات..!!

## بەهلولی داناو بەهلولی شێت

پیاوێکی بێ دەرامەتو کۆلەوار, بە گوێرەی شەرعو یاساکانی دەوڵەت هەندێك (پارە)ی وەك (میراتی باوك) بەرکەوت، رۆژ بە رۆژ بە ئارەزووی خۆی لێی دەخواردو لێی پاڵدەکەوت، رۆژێکیان ژنەکەی ئامۆژگاری پیاوەکەی کردو وتی: ئەگەر وا بڕوات یەك (قرۆشمان) نامینێ، وا باشە بەو بڕە پارەیەی ماومانە کارێك بکەیت!.
پیاوەکە وتی: ژنێ منێکی دەستوپێ سپی، خۆت دەزانی هیچ پیشەیەك نازانم، لە ژیانمدا جیرانی بازرگانێکیش نەبوومە، دەترسم دەست بۆ هەر کارێك ببەم ئەوەندە پارەی هەمانە ئەویشمان لە دەست بچێ !
ژنەکەی وتی: پیاوەکە ئەدی ناڵێن قسە، یان لە شێت، یان لە منداڵ وەردەگیرێ، دەبڕۆ قسەیەك لەگەڵ بەهلولە شێت بکە، بەڵکو خوایەو سوودێکی بۆمان دەبێت!
پیاوەکە ئامۆژگاری ژنەکەی لە گوێ گرتو چووە لای بەهلولە شێتو وتی: بەهلولی دانا هەندێك پارەم هەیەو دەمەوێ کارێکی پێ بکەم بۆ ئەوەی قازانج بکەم!
بەهلولە شێت پێی وت: بڕۆ پارەکەت بە (گەنم) بدە، چەند مانگێکیتر نرخی گەنم بەرز دەبێتەوە !

پیاوەکە بە قسەی کردو قازانجێکی باشی کرد، دیسان چۆوە لای بەهلولە شێت بۆ ئەوەی ڕێنمایی بکاتو وتی: بەهلولی دانا لە سایەی قسەکانی تۆ قازانجم کرد ئەمجارەیان چی بکرِم؟

بەهلولە شێت وتی: برِۆ پارەکەت بە (خوێ) بدە. هەم دیسان پیاوەکە قازانجێکی باشی کرد. ئەمجارەیان بەهلولە شێت وتی: برِۆ برنج بکرِە! پیاوەکە هەم دیسان قازانجی کرد، ئەم سێ جار قازانج کردنە بووە هۆی دەوڵەمەندیو لە خۆبایی بوونی پیاوەکە، بۆیە ئەمجارەیان بە لووتبەرزییەوە چۆوە لای بەهلولو وتی: بەهلولە شێت چی بکەم؟

بەهلولە شێت وتی: مانگێکی تر پەتایەك لە سەرتاپای وڵات بڵاودەبێتەوەو چارەسەرەکەشی تەنها بە (پیاز) دەبێت!، بۆیە تۆش برِۆ هەرچی پارەت هەیە بە پیاز بدەو بیانخە ناو (کۆگا)و هەموو پیازەکەش ئاورِشێن بکە ، بەڵام لە بیر نەکەی دەرگای (کۆگاکە) داخە تا یەك مانگ دەرگاکە مەکەوە!

پیاوەکەش وەك جاران ئامۆژگارییەکانی بەهلولی وەك خۆی جێبەجێ کردو هەرچی پارەی هەبوو بە پیازی داو خستییە نێو کۆگایەکی گەورەو بە کرێکارەکانی وت: پیازەکە ئاورِشێن بکەنو دەرگاکە داخەن!، پێش وادەی دیاریکراو پیاوەی تازە بازرگان چوو سەرێك لە کۆگای پیاز بدات، کە نزیکی کۆگاکە کەوتەوە هەستی بە بۆنێکی نێجگار ناخۆش کرد، کاتێك دەرگای کۆگای کردەوە لەبەر بەهێزی بۆنی بۆگەنی پیازەکە بوورایەوە، کاتێك چاوی کردەوە بینی هەموو پیازەکەی بۆگەن بوومو ئاوی لەبەر دەرِواتو قازانجو سەرمایەی تیاچووا!، پیاوەی تازە

بازرگـان چـۆوە لای بـەهلول‌و زۆر بـە توورِەیـیـەوە ڕووداوەکـەی بـۆ گێڕایەوەو نیگەرانی خۆی لەو زیانە زۆرە دەربڕی!،
بەهلولیش لە وەڵامدا وتی: قوربان هەتا ڕێنمایی باشم کردی‌و قازانجت کرد بەهلولی دانا بووم! کە زۆریش دەوڵەمەند بوویت، بووم بە بەهلولە شێت! کە بە گوێی شێتانیش بکەیت ئەوهات لێدێت.
منیش وتم: باشە خارە پەندو ئامۆژگاری لەم سەرگوزەشتەیە چییە؟
خـارە خولـە وتـی: زۆر کـەس هەیـە بـە دوو قروشـی کـەپوویان بڵنـد دەبێـت‌و خـزم‌و هـاوڕێ‌و کەسـە نزیکـەکانیان فـەرامۆش دەکـەن!، ئـەو ڕۆژگارانەیان لە بیر دەچێت کە نانیان نەبووە بیخۆن .

کۆلەوار : نە شارەزا لە پیشەیەکی دیاری کراو
قروش . پارە
دەست و پێ سپی : هیچ کارو پیشەیەك نازانێ
جیران : هاوسێ
بوورایەوە : لە خۆ چوو ، لە هۆش خۆی چوو
کەپوو : لووت
بۆگەن بووە : گەنیوە

## سه‌ردانی نه‌خۆش

پیاوێك هاوسێكه‌یان نه‌خۆش ده‌كه‌وێت، له‌به‌ر ده‌رگای ماڵه‌وه چاوی به كوڕه‌كانی پیاوه‌ی نه‌خۆش ده‌كه‌وێت‌و پرسیاری باری ته‌ندروستی باوكیان لێده‌كات! ئه‌وانیش ده‌ڵێن باوكمان دوو رۆژه له نه‌خۆشخانه خه‌وتووه، هاوسێكه‌شیان بۆ هاوسۆزی‌و ئه‌ركی هاوسێیه‌تی به كوڕه‌كانی نه‌خۆشه‌كه ده‌ڵێ: هه‌ر كاتێك چوونه لای باوكتان منیش له‌گه‌ڵتان دێم!، كوڕه‌كانی پیاوه‌ی نه‌خۆش وتیانه جیرانه‌كه‌یان: به سه‌رچاو ئێمه به نیازین دوای نیو كاتژمێریتر بچینه سه‌ردانی، كه كاتی هات بانگت ده‌كه‌ین، كاكه‌ی هاوسێ له‌گه‌ڵ كوڕانی پیاوه‌ی نه‌خۆش چوونه نه‌خۆشخانه، هه‌واڵی نه‌خۆشیان له چاودێره‌كه‌ی پرسی كه برا گه‌وره‌یان بوو، ئه‌ویش وتی: ئه‌مشه‌و خه‌و نه‌چۆته چاوه‌كانی، چونكه له دوێنێوه میزی گیراوه!، له‌و كاته‌ش پزیشك هات‌و وتی: نه‌خۆشه‌كه‌تان میزه‌ڕۆی گیراوه ده‌بێت (سۆنده‌ی) بۆ دابنێین، بۆیه یه‌كێكتان (كیری) باوكتان بگرن تا سۆنده‌كه‌ی بۆ داده‌نێین

كوڕه‌كانی پیاوه‌ی نه‌خۆشیش ڕووی ده‌میان له كاكه‌ی هاوسێیان كردو وتیان: له لایه‌ك ئێمه له روومان نایێ، هه‌رامه‌ی باوكمان بگرین‌و له‌لایه‌كیتر له‌به‌ر ئازارو ناڵه‌ناڵی باوكمان دڵمان ده‌بێت به ئاو، بۆیه ئه‌گه‌ر تۆ یارمه‌تی پزیشكه‌كه بده‌یت، سوپاست ده‌كه‌ین!.

پیـاوەی هاوسێشـیان بـە نیگەرانییـەوە وتـی: کاکـە مـن هاتیمـە لای نـەخۆش، یـان هاتیمـە کـیر گرتنـێ! کـەی ئەمـە ڕەوای هەقـە لـە چوار کوڕان من کیری باوکتان بگرم!؟ وەڵڵا من ئەو کارە ناکەم.

منـــیش وتم: وەڵڵا خـــارە پیـــاوەی هاوســـێیان ناهـــەقی نـــەبوە، ئـــەی توانجەکەی تۆ چییە لەسەر ئەو بەزمە؟

خـارە وتـی: هـاوڕێ سـامان کـاتی خـۆی ئەگـەر یـەکێك لـە گونـدێك بمردبایە، یەك مانگ خەڵکی گوندی پرسـەی بـۆ دادەنـا! ئێسـتا دیـواری ماڵـەومیان بـە یەکـەوە نووسـاوە، نـاوی یـەکتر نـازانن و سڵاو لـە یـەکتر ناکەن! لەوەش نیگەرانتر ئەوەیە بە سەدان منداڵ لە پێناو خۆشیەکانی خۆیـــــان خزمـــــەتی دایـــــك و باوکیـــــان ناکـــــەن و ڕەوانـــــەی بەساڵاچووخانەکانیان دەکـەن ! بـیر لـە ڕابـردوو داهـاتووی تەمـەنیان ناکەنەوە .

## كەلەشێرو دیاری

مام باپیر بە كوڕەكەی وت بڕۆ ناو مریشكو كەرەبابەكان (كەلەشێر) ێكی گەورەم بۆ بهێنەو پێیەكانی ببەستەوە، بەڵكو بە دیاری بۆ ماڵی مامت ببەینە كەركوك، مام (باپیر) بە خۆ بە (كەلەشێر) ەوە لە گوندەكەی خۆیانەوە بەڕێكەوت بۆ كەركوك لە ڕێگا هاوسەفەرەكانی لە نێو (پەست )ەكە بۆ خۆشیو كات بەسەربردن پێیان وت: حاكمی شار (مووتەسەریف) بڕیارێكی داوە بە هیچ شێوەیەك ئاژەڵو پەلەوەر نەیێتە نێو شار (مام باپیر) وتی: تازە نیوەی ڕێگامان بڕیوە خۆ (كەڵەباب) كۆتر نییە بەڕەڵڵای بكەمو بۆ خۆی بچێتەوە ماڵەوە بە تەمای خودای! مام باپیر بۆ خۆی جگەرەكێشێك بوو، هەر نەبێتەوە، جگەرەی بە جگەرە پێدەكردەوە!، لە تاو ئەو هەواڵە ناخۆشەش هەر پەڕە سیغارێكی دەپێچایەوە، ئەوەندەی پەنجەی دەستی ئەستوور بوو!، تا جگەرەكەی تەواو دەكرد پرۆشكی ئاگر وەك باروتی بەملاو بەولادا پەرشوبڵاو دەبۆوە، هەر پێی دەكرا ئاگر بكوژێنێتەوە !، جار بە جارێكیش نیوەی توونی ناو سیغارەكە بە ئاگرەوە دەكەوتە خوارەوە، یان دەكەوتە سەر شەرواڵەكەی، تا نەگەیشتبایە سەر گۆشتی لەشی هەستی بە ئاگرەكەی نەدەكرد؛ بۆیە كونێكی گەورە لە ئاست (كێری) كەوتە شەرواڵەكەی، سێ بەشی ڕێگایان بڕی و نزیك شار كەوتنەوە ( مام باپیر ) بیری كردەوە كەڵەشێرەكە بخاتە نێو شەرواڵەكەی! پلانەكەی جێبەجێ كردو كەڵەبابەكەی خستە نێو شەرواڵەكەیو

سه‌رى كه‌ڵه‌شێره‌كه‌ى له كونه سووتاوه‌كه ده‌رهێنـا، بـه‌ڵام كه‌ڵه‌شـێره‌كه ناوه ناوه سه‌رى ده‌بـرده‌وه ژووره‌وه‌و ده‌نـووكێكى لـه (كێـرى) مـام بـاپير ده‌دا، مـام بـاپير بـه پـه‌لـه سـه‌رى كه‌ڵه‌شـێره‌كه‌ى ده‌رده‌هێنايـه‌وه‌و بـۆ ماوه‌يـه‌ك ملـى ده‌گـرت بـۆ ئـه‌وه‌ى سـه‌رى نه‌باتـه‌وه نێـو شـه‌رواڵه‌كه‌ى!، (په‌سـت) ـه‌كه بـۆ ساردكردنه‌وه‌ى مه‌كينه‌كـه‌ى لـه‌و شـوێنه ديـاريكراوه وه‌سـتا كـه گوندنشـينانى سـه‌ر رێگـاى شـاره‌كان بـۆ فرۆشـتنى بـه‌رو بوومـه‌كانيان دروسـتيان ده‌كـرد!، كاتێـك په‌سـته‌كه وه‌سـتا (مـام بـاپير )چاوى به هه‌نجيرو ترێ كه‌وت، وتى با دوو سێ كيلۆ هه‌نجيرو ترێش بۆ ماڵى( ئه‌حمه‌د)ى برام بكڕم، كاتێك خه‌ريكى بژاركردنى هـه‌نجيرو تـرێ بـوو نـاوه‌ش كه‌ڵه‌شـێره فـه‌نى سـه‌رى لـه كونـه سـووتاوه‌كه‌ى شـه‌رواڵه‌كه‌يه‌وه ده‌رده‌هێنـاو ده‌نكـه ترێيـه‌كى ده‌بـرده نـاو شـه‌رواڵه‌كه‌و ده‌يخوارد!  ئه‌و رۆژه ميوه فرۆشه‌كه بۆ پشووه خه‌وێك ژنه‌كه‌ى له ديـار ميوه فرۆشتنه‌كه دانا بوو، ژنه‌ى ميوه‌فرۆش له لايه‌ك نيگه‌ران بـوو لـه سه‌روبن كردن‌و فليقانه‌وه‌ى هه‌نجيرو ترێيه‌كان بـه بيـانووى بـژاركردن، له لايه‌كيتر سه‌رى له‌وه سووڕمابوو له نێو گه‌ڵى پياوێك ڕێك له شوێنى هه‌رامه‌كه‌ى سه‌رو گه‌رده‌نێكى جوان هاوشـێوه‌ى كه‌ڵه‌شـێر ده‌نكـێ تـرێ ده‌خوات!، ژنه به توڕه‌ييه‌وه وتييه مام باپير: هۆ كاكـه‌ى ڕێبـوار ئـا ده‌ى سـه‌يرێكى مـن بكـه قـژه‌كانم سـپى بـووه‌و گـه‌رم‌و سـاردى‌و خۆشـى‌و ناخۆشيم له دنيايێ زۆر بينيوه ! ئه‌م شارو ئه‌و شارو ئـه‌م هـه‌وارو ئـه‌و هه‌وارم كردووه، كه‌چى تا ئێستا (كير) ى ئاوام نه‌بينيوه ترێ بخوات..!!، بڕۆ كاكه بڕۆ نايفرۆشم به‌خۆو به كيره‌وه ئه‌وه‌ى خواردتـان خواردتـان، ئه‌ويترتان فليقاندوه !!

منیش ئەوەندە پێکەنیم بە حاڵی مام باپیر، وتم: وەڵڵا خارە هەق بوو مام باپیر بەو قسانە شووکرانەی بکردایە، ئەگەر ژنەی میوەفرۆش بانگی پیاوەکەی بکردایەو بەخۆو بە پیاوەکەی چینێکی باشیشیان تێهەڵدایە ! توو خوا ئەوە سەفەرو دیاری بووە، یان بەڵای سەر؟!

خارە خولە وتی: هاورێ گیان ئێمەش رۆژگاری پڕ زەحمەتمان بینیووە، بەڵام هیچی وەك ئەو چەند ساڵەی دەسەڵاتی کوردی نییە، بە ناوی سیاسەتو عەولەمەو بازاڕی ئازاد، سەریان لێمان شێواندووە!، نەوت دەفرۆشنە هەموو دونیایێ کەچی ساڵانە لە وەرزی سەرماو سۆڵەش دە لیتر نەوتی سپی نادەنە میللەت!، بە ملیۆنان دۆلار وەردەگرنو مووچەو چارێگە مووچەش نادەنە مووچەخۆران..!!، بۆیە ئەمنیش نازانم ئەوە حکومەتە، یان بازرگانێکی مشەخۆر!.

پەست : ئۆتۆمبیل وەك جێبی ئێستا بوو

## پیاوکوژو نۆمەرمەندان

گروپێکی پیاوخراپ بە نوێژی نیوەرۆ هەڵیاندەکوتایە سەر خەڵکی‌و هەرچی پارەو کەلوپەلی بە نرخیان هەبوو لێیان دەستاندن، بۆ ئەوەی خاوەن ماڵ سکاڵا نەکات، تێروپڕیشیان لە خاوەن ماڵ دەداو نیوە ڕوحیان دەکردن . ڕۆژێکیان پیاوێکی لایدە ڕێی کەوتە شاری ئەو گروپە، چەند کەسێك دەست‌و پێی پیاوەکەیان بەستایەوەو خستیانە سەر پشتی گوێدرێژێك بۆ ئەوەی بیبەنە دەرەوەی شارو مارکوژی بکەن‌و هەرچی لە لایەتی لێی وەرگرن، کابرای لایدە یەك بە خۆی هاواری دەکرد خەڵکینە فریام کەون ئەوانە پیاوکوژن‌و دەمکوژن ئەوەی چاوسوورکردنەوەو لێدانی ئەو گروپەی پێکەوتبوو گوێی نەدایێ‌و دوور دەکەوتەوە، هەندێ خەڵکیش بە گروپەکەیان دەوت: کاگە بۆ وا لەو پیاوە دەکەن؟ گروپەکە دەیانوت: ئەوە برامانەو شێت بووە دەیبەینە (نۆمەرمەندان)، کابرا لە سەر پشتی گوێدرێژەکە سوێندی دەخوارد، کە ئەوانە ناناسێ‌و ئەوانە پیاوکوژو سەگبابن‌و دەیکوژن!، یەکێ لە ئەندامانی گرووپەکە دەیوت: کێشە نییە خوا بکەم ئەتوو چاك ببیەوە با ئێمە هەر سەگباب بین..!!

وتم: خارە توانجەکەت چییە؟

وتی: هاوڕێ سامان ئێستا کوردستان پڕ بووە لەو جۆرە گرووپانە، بە نوێژی نیوەڕۆیێ پیاو دەکوژن، چەندین رۆژنامەنووسیان شەهیدکرد، چەندین دۆلارفرۆشی کاسبیان کوشت، تەنها بە چاوسووورکردنەوە دەبنە برا بەشی چەندین بازرگان و کۆمپانیا بە بێ ئەوەی یەك دینار بدەن..!!

## دزینی مەڕێکی دابەستی

پیاوێك هەبوو بە ناوی (سمایل) پیرە مەڕێکی بۆ دابەستی کڕیو هێنایەوە ماڵەوە، هەرچی بە دەوان دەخورا بۆ ئەو پیرەمەڕەی دەهێنا، تا وای لێهات پیرەمەڕ بوو بە مەڕێکی خڕوخەپان، ئەوەندە قەڵەو ببوو, شەوێکیان دز دەچێتە سەر ماڵیانو مەڕەکە دەدزێ!، بەیانی کە سمایل خەبەری دەبێتەوە تەماشا دەکات پیرەمەڕی دابەستی نەماوە، ڕادەکاتە ژوورەوەو برنۆکەی دەکاتە شان کە تەنها یەك فیشەکی تێدادەبێت، بە چوار دەوری گوندیدا دەسووڕێتەوەو دەڵێت بەو گوللەیەی دایکی چەندان بگێم؟!

منیش وتم: خارە پێش ئەوەی گوێم لە توانجەکەت بێت، دێتەوە یادم لە سەرەتای شەڕی عێراقو ئێران ئەو کاتە ماڵمان لە مەخموور بوو، دوو مانگ پێش جەژنی رەمەزان، باوکی کۆچکردووم پیرە مەڕێکی بۆ دابەستی کڕی بوو، بەڵام پێش ئەوەی مەڕەکە بێنێتەوە ماڵ بردبوویە لای ( پزیشکی ڤێتەرنەری) دکتۆرەکەش پێی ووتبوو سێ چوار رۆژان ( کۆکا )ی بدەرێ ، (کۆکا) ی ئەوسا کە لە نێو شووشەدا بوو ، رۆژێ دوو جار، چوار پێنج دانەیێکی بۆ دەکردە ناو دۆلکەیەكو بە دەمی مەڕەکەیوە دەکرد، ئیتر ئەو مەڕە دەم نا دەمێ لە پێشو پاشا

دەیقرپاند، ئێمەش منداڵ بووین لە خۆشیانا دەکەوتینە سەر پشت ئەوەندە پێدەکەنین ! ئێستا بزانم توانجەکەت چییە!؟

خارە خولە وتی: توانجەکەی منیش هەر ئەوەیە لەم رۆژگارەدا دزو گەندەڵی وا هەیە، لە چوارچێوەی یاساو بە نوێـژی نیـوەڕۆیێ دزیمان لێدەکەن!، ئێمەی میللەتیش وەك سمایلی تەنها یەك گوللەمان هەیە نازانین دایکی چەندانی پێ بگێین..!!

## میوانی خوارزای

پیاوێکی بە ساڵاچوو بۆ سەردانی نەخۆشێکی خزمیان لە گوندەوە هاتە شار، دوای بە جێگەیاندنی ئەرکەکەی شەو چووە ماڵی خوارزایەکی بۆ ئەوەی بەیانی لەوێوە بەرەو لادێکەی خۆیان بچێتەوە! دوای نانخواردنی ئێوارەو هەواڵ پرسینی خزمانی گوند، خاوەن ماڵ کە دوو ژنی هەبوو بە ژنەکانی وت: جێگای خەوتنی خاڵم لە لای (سەلاجە، بەفر گرەکە) ڕاخەن، خاڵەش بەو پێیەی جێگۆڕ بووە شەو هەر کەلەکەی دەگۆڕی‌و خەوی لێ نەدەکەوت!، درەنگانێکی شەو خاوەن ماڵ دەستێکی بە لەشولاری ژنە بچوکەکەی داهێنا, ژنە وتی: پیاوەکە شەرمە خاڵت میوانمانە.

کوڕە بە ژنەکەی وت: بڕۆ دەرگای بەفرگرەکە بکەوەو قومێك ئاوبخۆو سەیرێکی خاڵم بکە بزانە خەوتووە!، خاڵۆ نەخەوتبوو، کە گوێی لەو ڕاوتەگبیرەی خوارزای بوو، جوولەی لە خۆی بڕی، ژنە چوو دەرگای بەفرگرەکەی کردەوەو کەمێك ئاوی خواردەوەو بە هێمنی خۆی خزاندەوە ژێر بەتانییەکەی،پیاوەکەش داخی دڵی خۆی پێدامرکاندەوە!، بەرە بەیانیان خاوەن ماڵ دەنگی ژنە گەورەکەیدا کە بێتە باوەشی، ژنە وتی: شەرم‌و شوورەیی خاڵت میوانە!

پیاوەکە وتی: خاڵم خەوتووە بۆ دڵنیایی بڕۆ کەمێك ئاو لە ناو سەلاجەکە بخۆوە؟

خاڵۆ بە هەمان بەزمی ژنەی بچووك وای نیشاندا کە خەوتووە!، ژنە دوای ئەوەی سەلاجەی کردەوەو ئاوەکەی خواردەوە بە هێمنی هاتە باوەشی پیاوەکەی، پیاوەکەش خۆی لەویش بەتاڵ کردەوە!

بـه‌یانی لـه کـاتی نـانخواردن پیـاوه‌ی خـاوه‌ن مـاڵ وتـی: خـاڵۆ گیـان ئه‌مشه‌و به باشی خه‌وتی؟ خۆ جێگاکه‌ت خه‌راپ نه‌بوو؟

خاڵی له وه‌ڵامدا وتی: جێگاکه‌م خه‌راپ نه‌بوو، به‌ڵام ئه‌وه‌نـده‌م تێنـوو بوو له تاوان خه‌وم لێنه‌ده‌که‌وت؟

خـاوه‌ن مـاڵیش وتـی: ئـێ باشـه بۆچـی بانگـت نـه‌کردین جامـه ئاوێکـت بـده‌ینێ!، ئـێ کـه دڵیشـت نـه‌هاتووه بانگمـان بکـه‌یت خـۆت ده‌رگـای به‌فرگره‌که‌ت بکردابوایه‌وه‌و ئاوت بخواردبوایه‌وه!

خاڵی به پێکه‌نین‌و توانجه‌وه وتی: وه‌ڵڵا کوڕم پیاوم ده‌ویست ئه‌مشه‌و سه‌لاجه‌ی بکردبوایه‌وه !

منـیش زۆر پێکـه‌نیم وتم: وه‌ڵا خـاره ئـه‌و سـه‌گباب خێـوه ئه‌گـه‌ر ڤیاگراشـی بخواردبایــه ده‌بوایــه ئه‌مشــه‌وه خۆڕاگربوایــه لــه ئاســت میوانه‌که‌ی!، به‌ڵام توانجه‌که‌ی تۆ چییه له‌سه‌ر ئه‌م به‌زمه؟

خـاره خوله وتـی: هـاوڕێ سـامان ئـه‌م میلله‌تـه‌ی ئێمـه‌ش خراپـی لێ قه‌وماوه، له کاتی هه‌ڵبژاردنه‌کان ده‌نگ به‌و حزبه ده‌دات، که گیـای بـۆ دێنێتـه چـۆکان‌و ده‌ڵـێ ئێمـه زۆرینـه‌ی ده‌نـگ به‌ده‌سـتبهێنین ئێـره ده‌که‌ینه ئـه‌ورووپا!، که‌چی دوای سه‌رکه‌وتنیشیان هاووڵاتیـان کـه دێنـه سـه‌ر شـه‌قام بـۆ وه‌بیرهێنانـه‌وه‌ی به‌ڵێنـه‌کانیان بـه دارو ئاسن‌و گولله ده‌که‌ونـه گیانیـان‌و ڕاپێچی به‌ندیخانـه‌کانیان ده‌که‌ن‌و هه‌نـدێکجاریش نانبڕاویـان ده‌کـه‌ن!، بۆیـه ئێسـتا به‌شـی زۆری هاووڵاتیـان بێـده‌نگییان هه‌ڵبژاردووه‌و پیاوم ده‌وێ له هه‌ولێر بێته سه‌ر سه‌قام‌و بڵێ ئـه‌رێ ئـه‌و دروشم‌و به‌ڵێنانه‌ی بانگه‌شه‌تان بۆی ده‌کرد بۆ جێبه‌جێی ناکه‌ن؟!

## سزای نابه‌جێ

کارو پیشه‌ی جوتیاری ئێجگار سه‌خته، به‌ڵام برای جوتیار له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بژێوی ژیانی خۆی‌و خانه‌واده‌که‌ی له‌سه‌ر ئه‌و پیشه‌یه وه‌ستاوه، هه‌ر چۆنێ بێت ده‌یگوزه‌رێنێت، ساڵانه دوای پێگه‌یشتنی به‌روبووم، برا جوتیاره‌کان به‌شێك له به‌رهه‌مه‌كانیان ده‌هێنایه بازاڕی شاره گه‌وره‌كان، ساڵێكیان نه‌خۆشییه‌ك بڵاو ببۆوه (مووته‌سه‌ڕیف)ی شار بڕیاریدا بۆ پاراستنی دانیشتووانی شار له‌و نه‌خۆشییه هه‌موو ده‌روازه‌كانی شار داخه‌ن‌و هاتنوچوون بۆ مرۆڤو كه‌لوپه‌ل‌و ئاژه‌ڵیش قه‌ده‌غه بێت!، هه‌ر كه‌سێكیش پابه‌ند نه‌بێت، یان ئه‌م یاسایه بشكێنێ، سزای بۆ دیاریكرا بوو!، جوتیارێكی دووره شاریش گوێبیستی ئه‌م بڕیاره نه‌بوو، بارێكی گه‌وره‌ی (زه‌یتوون)ی خسته سه‌ر پشتی دوو (وراغان)و به‌ره‌و شار كه‌وته‌ڕێ، كه گه‌یشته ده‌روازه‌ی شار پاسه‌وانانی به‌رده‌رگا پێیان راگه‌یاند كه (مووته‌سه‌ڕیف) هاتنوچوونی قه‌ده‌غه كردووه‌و هه‌ر كه‌سێكیش ئه‌و بڕیاره بشكێنێ سزای بۆ دانراوه سزاكه‌ی تۆش ئه‌وه‌یه له باره زه‌یتوونه‌كه‌ت تا جێگا ده‌بێته‌وه دانه‌دانه زه‌یتوونه‌كان ده‌كه‌ینه دواوه‌ت ، برا جوتیار هه‌ر چه‌نده بێ ئاگایی خۆی له‌و بڕیاره ده‌ربڕی‌و وتییه پاسه‌وانه‌كان: باره‌كه‌م ده‌به‌م‌و ده‌ڕۆم! پاسه‌وانه‌كان وتیان: بڕیارو سزاكه ئه‌وه‌یه‌و ده‌بێت جێبه‌جێ بكرێت بۆئه‌وه‌ی كه‌سیتر یاساشكێنی نه‌كات!

له کاتی پەیڕەوکردنی سزاکه برا جوتیارەکه لەسەر پشت ڕاکشابوو پڕ به دەمی پێدەکەنی!، پاسەوانەکان پرسیاریان لێکرد: تۆ حاڵی خۆت نابینی پاشۆڵت بووە به تەلیس به چی پێدەکەنی؟!
جوتیارەکه وتی: کاکه به حاڵی خۆم پێناکەنم به حاڵی هاوڕێ جوتیارەکانی دواوەم پێدەکەنم یەکێکیان دوو بار شفتی پێیەو ئەویتریشیان دوو بار کالیارو تەرۆزی!

به زەردە خەنەیەکەوە وتم: وەڵا خاره بڕیارەکەی مووتەسەڕیف زاڵمانه بووە!، بەڵام لەوەش زاڵمانەتر ئەوەیە پاسەوانەکانیش به بێویژدانانه بڕیارەکەیان جێبەجێ کردووە، وەك بڕیارەکانی هەرێم بەیانیەکەی بڕیاردەردەکەن پیاوە دڵسۆزەکانیان بۆ ئێوارەکەی دەیخەنە واری جێ بەجێی کردن، به تایبەتی ئەگەر بڕیارەکان زیاد کردنی باج و سەرانه بێت بەسەر هاووڵاتیانەوە!
خاره خوله وتی: هاوڕێ سامان ئەتوو خوێندەوارو هۆشیاری بڕۆ کیتابان بخوێنەوە، لەومتەی دنیا دنیایه هەر زوڵم له هەژاران کراوەو هەر فەقیریان کردووە به پەندێك بۆ فەقیرێکیتر..!!

## پاسەوانی کاروانی بازرگانان

بازرگانێك بۆ پاراستنی کاروانی بازرگانییەکەی لە دزو جەردە، لە شار جارِیدا کە بەهێزترین پیاوی دەوێت، دوای گەڕانو سووڕانو سەیرکردنی گۆڕەپانی یارییە زۆرانبازییەکان پیاوێکی چوار شانەی بەهێزو بەغیرەتی دەستکەوت!، دوای ڕازی بوون بە ئەرك‌و مووچەی مانگانەی، پیاوەی پاسەوان لەگەڵ یەکەمین کاروانی بازرگانی بە ڕێکەوت، لە ڕێگا تووشی پەنجا دزو جەردە بوون، دزەکان چوار دەوری کاروانەکەیانداو بازرگانەکەو پاسەوانەکەیان قۆڵبەست کردو خەریکی پشکنینی کەلوپەلەکان بوون، کابرای بازرگان ڕووی دەمی لە پاسەوانەکە کردو پێی وت: کاکە گیان ئەدی ئەمن ئەتووم بۆچی لەگەڵ خۆم هێنا، خۆ پشتی سێ بەشی پاڵەوانەکانی شارت لە زەویدا؟!

پاسەوانەکە بە بازرگانەکەی وت: هێشتا تووڕە نەبوویمە!

ئەمجارەیان بازرگانەکە بە دەنگێکی بەرز بە پاسەوانەکەی وت: کورە خەریکن جگە لە کەلوپەلەکان وشترەکانیش دەبەن! پاسەوانەکە دەیوت: هێشتا ماومە تووڕە بم !

لەم گفتوگۆیەی نێوان بازرگانو پاسەوان، یەکێ لە دزەکان وتییە بازرگانەکە: خۆت سەغڵەت مەکە، ئەگەر نا بە هەر پەنجامان تۆو پاسەوانەکەشت دەگێین ! پاسەوانەکە کە گوێی لەم جوێنو بێ ڕێزییە بوو غیرەت گرتیو هەر پەنجا دزو جەردەکەی تەختی زەوی کرد!

بازرگانه‌كه كه ئه‌مه‌ى بينى دڵى خۆشبوو، تا گه‌يشته شوێنى مه‌به‌ست، دواى پشوو بانگى پاسه‌وانه‌كه‌ى كردو وتى: كاكه ئه‌مه هه‌قه‌كه‌ت به زياده‌وه، نه هيچى من‌و نه هيچى تۆ خوا حافيزت بێت!

پياوه‌ى پاسه‌وان وتييه بازرگانه‌كه: قوربان بۆچى له كاره‌كه‌م ده‌رمده‌كه‌يت؟ ئه‌ى من له هه‌ر هه‌موويانم نه‌دا! بازرگانه‌كه به توانجه‌وه وتى: برۆ كاكه برۆ ئه‌من هه‌موو جارێ په‌نجا زه‌لامى له كوێ بێنم بتگێن !

منيش وتم: وه‌ڵا خاره هه‌قى بازرگانه‌كه‌يه، خۆ ئه‌گه‌ر دزه‌كان ئه‌م جوێنه‌يان نه‌دابوايه ره‌نگه لووتبه‌رزى پاسه‌وانى پاڵه‌وان كاروانه‌كه‌ى له ده‌ستبدايه، به‌ڵام توانجه‌كه‌ت بۆ ئه‌م قۆناغه چييه؟

خاره خوله وتى: هاورێ سامان ئه‌م ميلله‌ته‌ى ئێمه‌ش هه‌موو پاڵه‌وانن، به‌ڵام نازانم كه‌ى تووره ده‌بن له‌و هه‌مووه نا هه‌قييه‌ى كه حزب‌و حكومه‌ت به‌رامبه‌ريان ده‌يكات؟!

## دارێکی دوو فلیقان

کورێکی گەنج تازە ژنی هێنابوو، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگو رووی زێتر دەپەڕی!، باوکی کوڕە هەر چۆنێ بوو هۆکاری بێ تاقەتییەکەی بە کوڕەکەی درکاند، کوڕە وتی: ئەوەی ڕاستی بێت تا ئێستا نەچوومەتە لای بووکەخان!، هۆکاریشی ئەوەیە هەر جارێك بە نیازی ئەو کارە دەچمە ژوورەوە لە خۆشیان (ئەندامی نێرینەم) لە بن زگم دەداتەوەو هەر چەندی دەکەم سەر ناهێنێتەخوار!.
باوکی ئامۆژگاری کرد کە دارێکی (دوو فلیقان) وەك داری (دار لاستیك) لە گەڵ خۆی بباتە ژوورەوەو لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەی لە سەرەوە بۆ خوارەوە پاڵیی پێوە بنێ! کوڕەش ئامۆژگاری باوکی لە گوێ گرتو سەرکەوتووبوو، پاش ماوەیەك باوکی گوتییە کوڕەکەی: ئێستا چۆنی؟
کوڕە وتی: باوکە ئێستا زۆر باشمو وەك خەڵکی ئاساییم لێهاتۆتەوەو منیش دارەکەم فڕێدا!.
باوکی وتی: کوڕم ئەوەت لە بیر بێت ڕۆژێك دادێ دەبێت ئەمجارەیان لە بنی هەڵدەیەوە!

منیش بە پێکەنینەوە وتم: خارە بۆ ئەو بیرۆکەیە نەخەینە بەردەم بازرگانەکانی بواری تەندروستی بۆ ئەوەی جۆرە (دارێکی دوو فلیقانی) جوانو نەخشێندراو بێنن ! خۆ هەر هیچ نەبێت زیانی نییە وەك دەرمانە ئیکسپایەرەکانیان!.

خاره خوله به پێکەنینەوه وتی: هاوڕێ سامان قازانج له ڕوونی سەگیش هەبێت بازرگانەکان بازرگانی پێوه دەکەن، مەبەستی من لەو سەرگوزەشتەیه ئەوەیه خەڵك دەبێت ڕابردووی خۆی له یاد نەکات و بیریش له داهاتووی بکاتەوه.

## ده‌وڵه‌مه‌ندێكی ڕه‌زیل

له گوندێك پیاوێكی زۆر ڕه‌زیل‌و چاوبرسی هه‌بوو، ئه‌و پیاوه تێر به زگی خۆی نانی نه‌ده‌خوارد، ماڵ و منداڵی ڕه‌ش و رووت ده‌هاتنه به‌رچاوان له برسان و له بێ جلك و به‌رگی ، خه‌ڵكی گوندی هه‌موو شاره‌زای ببوون، رۆژێكیان هه‌موو پیاوانی گوند له دیوه‌خانی دانیشتبوون، یه‌كێ له پیاوه‌كان وتیه پیاوه ده‌وڵه‌مه‌نده ره‌زیله‌كه: سوارێك وا به‌ره‌و لای ماڵی ئێوه ده‌چێت، كابرای زه‌نگین وتی: كێ ئاگای له حاڵی كێیه شه‌ش دێ‌و شه‌ش ده‌ڕوات!.

منیش زه‌رده خه‌نه‌یه‌كم كرد وتم: خاره توانجه‌كه‌ت چییه؟
وتی: هاوڕێ سامان وه‌ڵامه‌كه‌ی ئه‌و پیاوه مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه كه زۆر خانه‌خوێ و میوان دۆسته !
ئه‌وه وه‌ك حكومه‌تی هه‌رێمه هاووڵاتیه‌كانی خۆی تێر ناكات و مافه‌كانیان زه‌وت ده‌كات به بیانوی پاشه‌كه‌ت ! كه‌چی سه‌دان ملیۆن دینارو دۆلار به ناوی جیا ده‌داته كۆمپانیاكانی ناوه‌خۆو ده‌ره‌وه به بیانوی چاكسازی و باشتركردنی سیسته‌می كارگێڕی.

## پشیلەو زەنگوڵ

پشیلەیەکی بە جوولەو چاوتیژ بە مشکان فێر ببوو، هەر رۆژەو چوار پێنج مشکی ڕاو دەکرد! مشکەکانی ناوچەکە هەموو کۆبوونەوەو ئەنجومەنێکیان لە مشکە زیرەکان و سەرۆکی گروپە جیاجیاکان پێکهێنا!، دوای چەند کۆبونەوەیەك و ڕا گۆڕینەوە، ئەنجومەن گەیشتنە ئەو ڕایەی زەنگوڵێك لە ملی پشیلەکە بکەن بۆ ئەوەی هەر کاتێك پشیلەکە هەنگاوی نا بە نیازی هێرشکردنە سەر مشکەکان، دەنگی زەنگوڵەکە بێت و مشکەکان دەرفەتی ڕزگار بوونیان دەبێت! ئەنجومەن بڕیاریاندا بۆ پەسندکردنی ئەم پێشنیارە سەردانی پاشای مشکەکان بکەن، کە بڕیارەکەیان بە پاشا وت، پاشای تەمبەڵ و تەوەزەل وتی: بیرۆکەیەکی زۆر باشە، بەڵام پیاوم دەوێ ئەو زەنگوڵە لە ملی پشیلەکە بکات!

منیش وتم: خارە لە ڕابردوو هەزاران پیاوی چاونەترس گیانیان لە پێناو پاراستن و سەربەخۆیی وڵاتەکانیان بەختکردووە، لە پێناو بەرژەوەندی گشتی و مافی هاووڵاتیان ڕەنجی زۆریان داوە، کەچی خەڵك ستایش و سوپاسگوزاری پاشاکان دەکات و ئەو جوامێرانە لە یاد کراون!

خارە خولە وتی: هاوڕێ سامان ئێمەی کوردیش لە ڕابردوو هەزاران پاڵەوانمان پێشکەشی ئەم میللەتە کردووە، لە ئێستاشدا هەزارانمان ئامادەنە گیانی خۆیان پێشکەشی ئەم خاکە بکەن، بەس ئەوەی من سەرەدەری لێدەرناکەم ئەوەیە بەرپرسەکان لە کەناڵەکان گیایان هێناوەتە جۆکان و دنیا چوار وەرزە بەهارە!، کەچی بە کردەوە هیچ لە گۆڕێ نییە!

## شێرێکی پیر

شێرێکی پیرو کەترە توانای ڕاوکردنی نەمابوو، برسیەتیش هێزی لێبڕی بوو، نا چار لە نزیک گوندێك خۆی حەشاردا، بۆئەوەی نێچیرەکی ئاسان بگرێت، وەك (مریشك، کەلەشێر، قاز، مراوی، بەرخێك، کاریلەیەك) ڕۆژێکیان وەختی خۆرئاوابوون لە دەرەوەی گوند تووشی کەلەشێرێك بوو، کەرەبابەکە کە چاوی بە شێرەکە کەوت هێز لە لەشیدا نەما، شێرەکە بە کەرەبابەکەی وت: هاوڕێ گیان ڕۆژئاوا بووەو کات درەنگە ناگەیتەوە ماڵ گیانەوەری دڕندەش لەو ناوە زۆرن دەترسم ئازارت بدەن، وەرە ئەمشەو میوانی من بەو خۆم تا بەیانی پاسەوانی میوانە خۆشەویستەکەم دەکەم، بەیانیش دەتبەمەوە بەردەرگای خاوەنەکەت، کەلەشێر کە گوێی لەم قسە خۆشانە بوو هەڵخەڵەتاو لەگەڵ شێرەکە ڕۆیشت، نیوە

شەو شێرەکە بە توڕەییەوە بە کەڵەبابی وت: هاوسێکانت گلەییان لە لام کردووە کە نیوە شەوان بە (قوقەقوق) لە شیرین خەودا بە ئاگایان دەهێنییەوە!
کەرەباب وتی: قوربان ئەوە بەهرەو پیشەمە!
ئەمجارەیان شێر پێی وت: بۆچی پار (جون)ت بە من دا؟

كەلەشێر وتی: قوربان من فرِوجی ئەمساڵمو هێشتا تەمەنم نەبووە بە ساڵێك!
شێرەكە وتی: دەنا برات بوو جوێنی بە من دا؟
كەڵەباب وتی: قوربان من تاقانەی دایكمم!
شێر نەڕاندیو چرِنۆكەكانی لە كەرەبابەكە گیركردو وتی : ئەگەر دواین كەڵەبابی دنیایێ بیت، هەر دەتخۆم.
وتم باشە خارە توانجەكەت چییە؟
وتی هاورِێ سامان ئێستا لە كوردستانیش زۆر كەس بە ناوی پاراستنی یاساو بەرگریكردن لە كوردو كوردستان وەك شێرەكە بە هەر بیانوویەك بێت دەیخۆنو كەسیش ناڵێت لە پشتی چاوتان دوو برۆ هەیە!

پیرو كەترە : پیرو پەككەوتە
كەرەباب : كەڵەباب ، كەڵەشێر
قوقە قوق : بانگدانی كەلەشێر
جون : جوێن
فروج : مریشك و كەرەبابی تەمەن كەمتر لە ساڵێك

## بیرەوەریەکانی مامۆستا ( ڕەوەند )
## لەگەڵ خارە خولە

### خارە خولە خارو دڵسۆزی هەمووان

خارەخولە کە بە خاری هەمووان لە ناو ڕیزەکانی حزبی شیوعی کوردستان ناسراوە ، هەمووانیش بە گەورەو بچووکەوە بە خارە دڵسۆزەکەی خۆیانی دەزانن و دەیناسن ، خارەخولە لەبەر ئەوە نیە کە تەمندارە بۆیە ناونراوە خارەخولە ، بەڵکو کاتێك هاوڕێیان نازناوی خارمیان پێبەخشی خارەخولە لە هەرەتی لاوێتیدا بووە ، خارەخولە بەم نازناوە ناسراو ناوبانگی بلاو بۆوە لە کوردستان و لە لای هاوڕێیانی حزبی شیوعی عێراقیش خۆشەیست و ناسراوە ، خارەخولە مرۆڤێکی دڵپاکەو بەڕاستی مرۆڤ دۆستە هەموویانی خۆش دەوێت و دڵی هێندە گەورەو فراوانە شوێنی گشتییانی تێدا دەبێتەوە قسەکانی خارەخولە یەکجار خۆش و تەژی تام و چێژن و مرۆڤ هەر ئارەزوو دەکات گوێبیستی بێت ، گەلێك جار کە قسە دەکات شێوەیەك لە گاڵتەو گەپی پێوە دیارە ، بەڵام لە ڕاستیدا هەمووی وتەی پڕ ماناو پەندوو ئامۆژگاریە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەو کەم و کوڕیەکان ، کاریگەرییان هەیەو سوود بەخشن ، لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە هەندێ قسە نەستەق و وتە بەنرخەکانی خارەخولەی ئازیز بکەم .

* پاش ئــه‌وه‌ی هێــزی پێشــمه‌رگه لــه ســنوره‌كان جێگیربــوون ، لــه شاروگونده‌كان دووركه‌وتنــه‌وه ، بــه‌رده‌وام ڕۆژانــه ژنـانی كـه‌س و كـاری پێشـمه‌رگه بـۆ لای كـوڕو بـراو هاوســه‌ره‌كانیان ده‌هـاتن و هه‌وڵیانـده‌دا پێشـمه‌رگه‌كان ڕازی بكـه‌ن و بگه‌ڕێنـه‌وه‌و واز لـه پێشمه‌رگایه‌تی بێـنن خۆیان به ده‌سته‌وه‌ی رژێم بده‌ن له‌و ماوه‌یه‌دا هاوڕێ خاره‌خوله‌م بینـی به یه‌كه‌وه باسمان له بارودۆخه‌كه كرد ،
خاره‌خوله وتی : جاران له گوندی ئێمه‌و گونـده‌كانی تـریش كـه ژن لـه مێرده‌كه‌ی زیز ده‌بـوو ده‌چۆوه مـاری بـاوان پـاش ماوه‌یـه‌ك مێرده‌كـه‌ی ناچـار ده‌بـوو هه‌وڵبـدات خێزانه‌كـه‌ی بێنێتـه‌وه‌و پێكبێنـه‌وه بـۆ ئـه‌م مه‌به‌سته‌ش دوو سێ سـه‌ره ژنـی گونـدی ڕێكده‌خست بـۆ لای ژنه‌كـه‌ی ڕه‌وانه ده‌كرد بۆ هێنانه‌وه‌ی ژنه‌كه‌ی به هه‌ر جۆرێـك بوایـه ژنـه‌یان بـۆ پیاوه‌كـه ده‌گێڕایـه‌وه ئێسـتاكه وه‌زعـی پێشـمه‌رگه‌و هـاتنی ژنــان بــۆ بردنـه‌وه‌یان وه‌كـو ژنـه زیـز بوه‌كـانم دێتـه به‌رچـاو هـه‌ر پێشـمه‌گه‌یه‌و به‌گه‌ر دوو سێ ژن ده‌كه‌وێ و ده‌گه‌ڕێته‌وه به‌خوا هه‌ر دوعا ده‌كـه‌م كـه ڕزگاربین له سه‌ردانی ژنان و ڕجاو تكاو گریانیان ! به‌ڕاستی پیاو خـۆی پێناگیرێ ئـێ چ بكـه‌ین چار نیـه‌و حـزبیش ڕێگـر نیـه بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌و هاوڕێیانه له شار كاری حزبی بكه‌ن .

* لـه پـایزی سـاڵی ١٩٨٨ و دوای شـاڵاوه‌كانی ئـه‌نفال بـۆ سه‌رناوچـه‌كانی كوردســتان و پاشه‌كشــه‌ی هێــزی پێشــمه‌رگه‌ی كوردســتان بــۆ ناوچــه سنورییه‌كان و جـێگیر بوونیـان پێشـمه‌رگه‌كانی حزبمـان باره‌گایـان لـه

ناوزەنگ و نۆکان دورست کردو رێکخران ، هێزی پێشمەرگە جولەو کاری پێشمەرگایەتی کەم بۆوە هاورێیانی پێشمەرگە لە بارەگاکان بەبێ کارو ئەرك بون ، رۆژێکیان خارەخولە هاتە لام

وتی : رۆژێك دێت سەردەکەوین و دەچینەوە شاری هەولێرو بارەگای حزبمان دەبێت ، مەسئولەکان دەگۆڕێن و جلو بەرگی پاك وخاوێن دەپۆشن و بە سیارە هاتووچۆ دەکەن منیش پیر دەبم و بە گۆپاری دەستم دێمە بارەگاو مل پێوە دەنێم بۆ لای سەرەوە دەچم ، یەك دوو پێشمەرگەی دەم رووت قۆرم دەگرن و دەڵێن : مامە کێوە دەچیت ، منیش دەڵێم کاکە دەچمە سەردانی هاورێیانی مەسئوول لەگەڵیان پێشمەرگە بوومە !

پێشمەرگە دەم رووتەکان پارێکم پێوە دەنێن و دەڵێن : مامە هاورێیان کۆبونەوەیان هەیەو ناتوانن بتبینن !

رۆژان هات و رۆژان رۆیشت هاتینەوە شاری هەولێرو بارەگا کرایەوە هاورێیانی سەرکردایەتی و کادیرو بەرپرسەکانی پێشمەرگە لە بارەگاکانی حزب سەرقاڵی کاری حزبیان بوون رۆژێکیان خارەخولە دێتە سەردانی بارەگاو بەرەو ئەو ژوورە دەچێت کە هاورێ ( عەزیز مەحمەد ) یادی بەخێر لەگەڵ هاورێیانی تری لێدەبێت ، پێشمەرگەیەك کە لەبەر دەرگاکە دەبێ رێگا بە خارەخولە نادات سەردانی هاورێیان بکات لەم کاتەدا چاوم بە خارەخولە کەوت و بەپێکەنینەوە

وتی : ئەم گوت کە دەچمە بارەگا پێشمەرگەی دەم رووت رێگام لێدەگرێ دەڵێ هاورێیان کاریان هەیەو برۆ مەجالی دیتنی تۆیان نیە

بزانە ئەو ( کۆتر بازە ) مەبەستی پێشمەرگەکە بوو ، ئەوە ڕێگام نادات بچمە سەردانی هاوڕێیان .

* ڕۆژێکیان لە بارەگای کۆمیتەی پارێزگای هەولێر چاوم بە هاوڕێ خارەخولە کەوت پێکەوە ماوەیەك دانیشتین خارەخولە فەرمووی : هاوڕێ ڕەوەند شتێك هەیە بە تۆی دەرێم ، بەڵام بۆخۆت بێ و بەکەسی مەرێ ، من و هاوڕێ ( ئەبو دلشاد ) یادی بەخێر لە ماری خۆمان گرێچین ، هەر رۆژێك ژنەکانمان لێمان تورەبن لە ماری دەرمان دەکەن ، چونکە ئێمە لە پیاوەتی کەوتووین خانووەکانمان بە ناوی ژنەکانمان تاپۆ کردووە ، ئەگەر من دەرکرام دێمە ماری ئێوە ( ئەبو دلشاد ) یش کێوە دەچێ بابچێ !

مامۆستا ڕەوەند ٢٥ / ١ / ٢٠١٨

## بیره‌وه‌رییه‌كانی هاوڕێ (زیره‌ك كه‌مال)
## له‌گه‌ڵ خاره خوله

باسكردن له هاوڕێ (خاڵه خوله) باسكردنه له كۆمه‌ڵێك كه‌سایه‌تی، چونكه ئه‌و مرۆڤه خۆنه‌ویست‌و ئێسك سووك‌و خۆش مه‌شره‌ب‌و ئاوه‌دانه، ته‌نانه‌ت له سه‌ختترین رۆژه‌كانی ته‌مه‌نیشی قسه‌ی خۆش‌و نوكته‌و گه‌شبینی به وێنه‌ی راوی هه‌نگوینی شانه‌ی ناو كلۆره دار لێ ده‌چۆڕا.

خاڵه خوله ده‌یزانی ژیان به‌س سیاسه‌ت‌و هه‌ڵوێستی شۆڕشگێڕی نییه به‌ڵكو قسه‌ی خۆشیشه، ئاخر ساڵانه له فه‌ره‌نسای بێشكه‌ی رۆشنگه‌ری‌و عه‌قڵانییه‌ت‌و فه‌لسه‌فه بڕوانامه‌ی دكتۆرا له‌سه‌ر نوكته‌كانی شۆڕشی فه‌ره‌نسا وه‌رده‌گیرێت.

هاوینێكی گه‌رمی ساڵی (١٩٨٩) بوو، هێزێكی پێشمه‌رگه‌ی شیوعی بووین‌و چووینه گوندی گه‌ڕاوی ده‌شتی هه‌ولێر، دواتر من‌و خاڵه خوله‌و دوو له هاوڕێیانی تر چووینه ماڵێكی په‌ڕگه‌ی ئه‌و گونده، لای خاڵه خووله هه‌موو ره‌گه‌زێكی مێ كچ با یان ژن ناوی (عه‌یشێ)ی به‌سه‌ردا ده‌بڕی، واتا به هه‌مووانی ده‌گوت عه‌یشێ، دوای سلاوكردن‌و دانیشتن‌و به‌خێرهێنان (خاڵه خوله)ی مرۆڤ دۆست رووی كرده ئافره‌تی ماڵه‌كه‌و پێی گوت (عه‌یشێ) كووی!! به رێكه‌وت ئافره‌ته كه ناوی عه‌یشێ بوو، به رووێكی خۆش رووی كرده (خاڵه خوله)و گوتی:

کو دەزانی من (عەیشێ)م، دیارە ئێوە ئێمە دەناسن، (خاڵەخوڵە) گوتی خوشکم ئێمە کەسێك نەناسین هەر نانیشی لە ماڵێ ناخۆین، ئیدی کەشی دانیشتنەکە گۆڕاو لە غەریبیەو یەکتر نەناسەو بووینە دۆستو ئاشنا، کە رۆیشتین ئافرەتەکە بە گەرمی ماڵئاوایی لێ کردین‌و گوتی بەخێربێن سەرچاوی عەیشێ.

زستانێکی ساڵی (١٩٨٤) پۆلێك پێشمەرگە بووین چووینە گوندی (مێرەگ) سنووری شارۆچکەی ئاگرێ، بە رێکەوت هاوڕێ (خاڵەخولە)ش چەند رۆژێك پێشتر چۆتە هەمان گوندو هەمان ماڵی ئێمەی لێ بووین، کچێکی گەنجی ئەو ماڵە کەزانی ئێمە پێشمەرگەی شیوعین گوتی ماوەیەك پێش ئێستا پێشمەرگەیەکی ئێوە هاتە ماڵەکەی ئێمەو هەر لە دوورەوە بانگی دایکیمی کرد (وەیش جەرگم خەرابی) دیاربوو دایکمی دەناسی بەس نەیزانیبوو لە پارەوە مردووە، تومەز دایکی کچەش ناوی عەیشێ بووە. (خاڵە خولە)ش وەکو هەموو جار عەیشێ‌و عەلەیکومی بەیەکەوە بوو.

## بیره‌وه‌ریه‌کانی هاورێ ( عه‌ولا پۆلا )
## له‌گه‌ڵ خاره خوله

هـاورێی خۆشه‌ویسـتم سـامان قه‌ره‌چوغی داوای لێکـرد بیره‌وه‌ریـه‌کانم له‌گه‌ل خاره‌خوله‌ی تێکۆشه‌ری شاخ و شار به‌چه‌ند په‌یڤێك بنووسمـه‌وه ، خه‌یاڵم وه‌کو تیشکی هه‌تاو به‌سه‌ر به‌فری سپی قه‌ندیل ئه‌پڕژێته‌وه ، له‌کوێ ده‌ستپێبکه‌مه‌وه له ڕاستیدا بیره‌وه‌رییه‌کانم له‌گه‌ڵ خاله‌خولـه‌ی ئێجگـار زۆرن ، رۆژهه‌ڵـده‌هات تامـه‌زرۆی رۆژێکـی نـوێی ئـازادی و سه‌رکه‌وتن بووین ، هه‌موو به‌یانییه‌ك خاله خولـه بـه وتـه خۆشـه‌کانی رێگای تێکۆشانی سه‌ختی نزیك ده‌کرده‌وه ، له رۆژانی شه‌رو مقاوه‌مـه‌ت خاله خوله ده‌بووه بیکه‌یسی وه‌کو ئاگر به‌رووی دوژمنان ده‌ته‌قییـه‌وه ، له ناو منالانی گونده ئازادکراوه‌کان خاله‌خوله‌م بـینی وه‌کـو منـاڵ یـاری چاوشلکانێی له‌گه‌ڵ ده‌کردن ، له رێگاوبانـه‌کان ده‌بووه مه‌تارمیـه‌ك ئـاوی کانییه سازگاره‌که‌ی ساوێنی بناری قه‌ندیل و تێنوێتی ده‌شکاندو گـه‌روی وشـکی تـه‌ر ده‌کـرده‌وه لـه شـه‌وانی تـاریکی ژێـر ده‌سـته‌ی داگیرکـه‌رانی کوردسـتان ده‌بـووه مۆمێـك خـۆی به‌ماڵـه هه‌ژاره‌کانـدا ده‌کـردو شـه‌وی تاریکی روناك ده‌کرده‌وه .

★ رۆژێکی به‌هاری ساڵی ١٩٨٢ نزیکه‌ی بیست پێشمه‌رگه بـوین ، دوای ماندوبونێکی زۆر له‌سێگۆشه‌ی گونـدی داربه‌سـه‌رو ئیلینجـاغ و سماقـه ،

له هەورازێك دانیشتین پشوومان دا ، شەهید كۆچەر هەڵیدا ، ئەوەی بچێتە خوارەوە یەك دیناری دەدەمێ ! من دەستم بڵند كرد
وتم : خالەخوله دینارەكەی وەرگرە ، چوومە خوارەوە و نزیكی هاتنە سەرەوە بووم ،
شەهید كۆچەر وتی : نەخێر نەچوویە خوارەوە ، گەر راستە بۆقێكی بچوكم لەگەڵ خۆت بۆ بێنە ؟
ناچار گەڕامەوە فەرخە بۆقێكم بۆ هێنا، خالەخوله ئەو هەورازەی ناولێنا هەورازی ( عەولاپۆلا ) دینارەكەم وەرگرت ، له گوندی سماقە هەمووومان بیبسی و كێكمان خوارد و رووبعێكیش مایەوە .

★ شەوێكی پایزی ساڵی ١٩٨٣ دوای ئەوەی لە سنوری ئێران تاكو بارزان دەگەڕێینەوە بارەگاكان له بارزان دیسان هەڵدەدەن ، بەلام ئێمە پۆلێك پێشمەرگە حەزمان لە ژیانی بارەگاكان نەدەكرد، بۆیە هەر زوو لەگەڵ شەهید عەباس سەر لقی هەولێر بریارماندا بۆ ناوچەی دەشتی هەولێرو شەمامك و كەندێناوە بگەڕێینەوە ، لە گوندی ( قۆریتانی ) سەر جادەی هەولێر مەخمور خۆمان بە ماڵی مام سەعدی قۆریتانی باوكی شەهید سەربازی دەكەین ، تەقەی جاشەكانی ( جەلال پیربال) ی ئەو شەوە نەیانبریەوە ، كە گەیشتینە ماڵیان دایكی شەهید سەرباز وتی : دڵم خورپەی كرد ئەو سەگوڕە دەبێ بۆ سەربازی كورم نەبێ ! قسەكەی ڕاست دەرچوو، ئۆخەی ئەوجارەش سەربازی زێدە جەرگم دیتەوە ، لە ناو باوەشی تێر تێر بۆنی كرد، دەستێكی بەناو پرچی داهێناو لە ئەسپێی دەگەڕا ، ئۆخەی كوری من ( زیندی ) تێدا نییە !

خاڵه خوله وتی : لۆ دایه دیاره ئێمه حوشترمان تێدایه ! ئه‌رێ مام سه‌عدی ئه‌و جاشانه بۆ واته‌قه‌یان نه‌ده‌بڕانده‌وه ؟

مام سه‌عدی: کوره ئه‌وه هه‌تره‌قیان چووه له ترسی پێشمه‌رگه‌ی شه‌وان هه‌ر سه ڕه‌ویان گوێ لێ بێت ، ئیتر ده‌ڵێن پێشمه‌رگه هات به‌سه‌رمان داده‌ده‌ن و ته‌قه‌ی نابڕنه‌وه ! ئه‌و نه‌گبه‌ته‌ی له‌کۆل ناوچه‌که‌ی ده‌که‌نه‌وه ؟

هه‌ر له بۆسه‌یه‌کی پێشمه‌رگان قۆریتان له جاشان پاك ده‌کرێته‌وه . له‌و جاده‌یه پێشمه‌رگه بێ سانسۆر ده‌سورایه‌وه .

★ خاڵه خوله هه‌ندێ جار سوعبه‌تی له‌گه‌ڵ ئه‌بو حکمه‌ت ده‌کرد، ده‌یگۆ به‌خوا تۆ ده‌بیته وه‌زیرو منیش هه‌ر کرێکاره‌که‌ی جاران ، دوای ڕاپه‌ڕین خاڵه‌خوله‌م بینی کرێکاری ده‌کرد،

وتم : خاڵه ئه‌وه بۆچی باره‌گات چۆل کرد؟

خاره وه‌ڵامیداوه بیست ساڵ له‌مه‌وبه‌ر وتم : ئه‌بو حکمه‌ت ده‌بێته وه‌زیرو منیش کرێکار ، ئێ باشه بۆ ! مۆره‌که‌م فرێداو چیتر به‌که‌ڵکی من نایه‌ت ژیانی کرێکاریم لا خۆشتره ! هه‌ر پێنج قاره‌ی جیهان داوام لێ بکات من هه‌ر کرێکاری سه‌رده‌می جارانم من له‌مێژه ده‌ڵێم سه‌رکرده ده‌بێ له پێشه‌وه بێ ، له شه‌ردا، له کارکردن دا له‌مێژه ده‌ڵێمه‌وه من سه‌رکرده‌ی بندیوارم ناوێ .

★ کۆچ به‌ره‌و مه‌مله‌که‌تی ئاخونده‌کان له‌گه‌ڵ پێشمه‌رگه‌یه‌کی روح سووکه ، خه‌می نیشتیمانی له کۆڵی خۆی گرێداوه ، کۆچ له باشووره‌وه

بۆ رۆژهەلاَت بە هۆی نەخۆشی سنوورەکان دەبەزێنین و لەو دیو بۆ ئەم دیو وەك مەل بالهەلٚ نەگرین لەگەلٚ( خارەخوله )ی ماندی بوونت لە بیر دەچێ و بیرەوەرییەکان کۆتاییان نایێ ، دوای ئەوەی خارەخولە نەخۆش دەکەوێ ، توشی نەخۆشی مەلاریای دەبی لەرزوتا دەیگرێ هەموو رۆژێك لە یەك کاتدا لەرزو تایەکە دووبارە دەبێتەوە هەموو گیانی وەکو مەشکەی دەهەژێ برپاریاندا خارەی بۆ شاری( ورمێ ) بەرین بۆ ئەو سەفەرە خۆمان ئامادە کرد لەگەلٚ هاورێ (خەیری ) عێراقی بۆ لای هەواری مام ( عەلی رەزگە ) ی بەرێکەوتین بۆ ئەوەی هێسترەکی لە مام عەلی رەزگەی وەرگرین خەیری وەکی بە قەولی ( مەلا نەفتە ) ی بە هەموو کەلەنەکی وەدەچوو ، لە هەموو مەجلیسێکا هێوێن بوو ، لە هەموو کارێکیش دەستی رەنگینی دیار بوو ، دەستیشی دەرۆیشت ئەو لەگەلٚ( ئەبو حوکمەتی )پێکەوە بوون ، وەرەقەی نەدەویست چونکە ولاَغیش بە وەرەقە وەردەگیرا !

خەیری لە دوور را وتی : مام عەلی بوارەکە خۆشە داکی منداران لۆ ناهێنی بۆ ئەو بوارە خۆشەی ؟

مام عەلی : لە ناو حوکمەتۆکی سەدام جا کێ لۆم بینی ؟ رێوبانیان هەموو گرتینە جامە ماستەکیش بازگەکانی رژێم ئیزن نادەن .

خەیری وتی : جا ئەمن بەیانی جوابەکێت بۆ دەنێرم ئەتو جێو رێگەم پێ بلێ ؟ مام عەلی رێگامان دوورە ولاَغەکەمان لۆ جەلد بکە ؟

مام عەلی قامکەك پووش لە ناو لەپی بۆ ناو کورتانەکەی پالٚ دەدا ، سوژنەکی لە دەستە تەقەر تەقەر کورتانەکەی پێکەوە گرێدەدا ، مام

عـەلی راسـتە بەرپرسـی ولآغـان بـوو ، بـەلآم كورتـان و پـاروو ڕەشمـەی هەمووی بە خۆی دورست دەكرد ،

ئـەرێ مـام عـەلی ڕێگامـان دووره لەوانەیـە زۆرمـان پـێ بچـێ لـە نێـوان هەفتەك یـان دوو هەفتـەی تێپـەڕ ناكات گـەر تووشـی هـیچ كـارێكی نـا جۆر نەبین .

مام عەلی وتی : مادام لۆ( خارەخوله) یە سەرچاوان هێستری بـۆرەی بـۆ كورتـان دەكـەم ، بـەران هێسـترەكی گەلـەكا نـازداره ئـەتو دەزانم ئەفەندیلۆكەی نەكەی باری گرانی لێ بار بكەن ؟

نا نا خەمت نەبی هەر خارەخوله عەیب نەبی سواری دەبـی ، بـە هـۆی نەخۆشییەكەی هەند لاواز بووه ناوقەدی وێك دەكاتەوه !

خەیری : دەزانم هەنكی داكی مندارانت خۆش دەوێ !

مام عەلی ئەوه كو دەزانی خەیری ؟ ئەوجا دەبی گەلەكو ئاگا لێبێت !

وەی سەرەسەرو سەرچاوان مام عـەلی ئـەمن ئەفەندیلۆكـە بـووم ، بـەلآم مەڕو مالآتمان هەر هەبووه !

مام عەلی : ئەوجا كەسی خارێ مادامەكی خۆت باشی لێدەزانی.

* زۆر جاران ئەمەی دووباره دەكردەوه ، كابرایەك لەگەل جیرانەكەی تووشی دەمەقالێ دێـت ، ئـەو شـەوه لـە داخـی ئـەو كابرایـە خـەوی لـێ دەزڕێ ، شەوی زستان ساردو سەرما، سەر لەبن بەتانی دێنێتـە دەرەوەو دەڵێ پێشمەرگە بۆ دیار نیینه، بـە قەلـەمبازەكی بـەهانام بگـەن بـەڵكو دەردی ئەو كابرایەم بۆ تیمار بكەن .

★ بەرێوەینە بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشە یاد بکەینەوە ١٤ی تەموزی سالی ١٩٨٧ بەبۆنەی یادی شۆڕشی ١٤ گەلاوێژی عەبدولکەریم قاسم ، بۆ دەشتی کاکی بەکاکی هەولێر شۆر بووینەوە ، ویستمان چالاکییەك بەو بۆنەیەوە ئەنجام بدەین ، بۆیە زوو بۆ ئەو دەشتە بەرێکەوتین ، بەو نیوەرۆیە گەرمە چاومان سۆر هەلگەرابوو، گەرما گەرووی وشك کردبووین، بەهۆی هەورازو نشێوی ( بایزئاغەو سماقە) و هەرتەك هەرتەکی( گیرەی رەش ) و هەورازی( رەسول بسکۆری ) هورگمان لە برسان قۆڕەی لێوە دەهات ، ژمارەمان چواردە پێشمەرگە بوو، گۆتیان با لە گوندی (پۆریجە ) تەوزیع بین ، بۆ نان خواردنی نیوەرۆ بە ئۆتۆمبێلێکی دەبل قەمەرە چوینە گوندی پۆریجە و لە گوندی تەوزیح بوین ، شوێنەکەمان لە شاری هەولێر زۆر نزیك بوو، بۆیە ترسی کەمینی جاشان و کۆپتەریش هەبوو ، لە گەل خالە خولە چوینە مالێك بۆئەوەی نانەکی بخۆین ، خیزانی مالەکە دەستی کرد بە ناوسێری کردن ، زوو ناوسێری ئامادەبوو، قاپێك ماستی ترشاوی چەند رۆژەی مانگای زەردی لەگەلٚ چەند ناوسێریەك لەپێش ئێمە داناو خالە خولەش لە بۆنی ماستە ترشاوەکە هێرنجی هاتێ !

ملازم هەژار سەیریکی خالە خولەی کرد بینییم بە تی چاو سەیری کابراو ژنەکەی دەکرد ، خالەخولە دلٚی دەیگۆ لەوانەیە بەو گەرمایە مانگیان لێ گۆرابی ، ئاخر ناوسێری هەر لە کاتی پارشێوانی مانگی رەمەزان لە کوردەواری دەخورێ ، بەو گەرمایە خارە لە دلٚی خۆی گۆتی دەبی مانگی رەمەزان بێ ، ژنە چای بۆ تێکردین و خالە خولە دەستی دایە ناوسێریەکەی سەرەوە زۆر رەق بوو قەپارەی لە ناوسێری

ره‌قدا خرمه‌ی ناوسێری ده‌هات سه‌یری كابرای خاوه‌ن ماڵی كرد گوتی :
خاره‌ ئێستا ده‌زانی چ مانگه‌ ؟
كابرای خاوه‌ن ماڵ تێنه‌گه‌یشت هیچ ورته‌ی لێوه‌ نه‌هات !
خاله‌ خوله‌ گۆتی : كاكه‌ ره‌مه‌زان پێنج شه‌ش مانگی ماوه‌ شه‌شه‌رانو حه‌فته‌رانیش نییه‌ ! ئه‌دی به‌و گه‌رمایه‌ ئه‌م ناوسێریانه‌ چیه‌ بۆ ئێمه‌ت دروست كردوه‌ ؟
ملازم هه‌ژار خاوه‌ن ماڵه‌كه‌ی ده‌ناسی بۆیه‌ خاله‌ خوله‌ ڕووی تێكرد وای زانی خه‌تای ملازمه‌ ئه‌و خواردنه‌یان بۆ ساز كراوه‌
گوتی : ئه‌رێ ملازم ئه‌و ره‌بیانه‌ی بۆی ده‌چین به‌و ناوسێریانه‌ ده‌گیرێن ؟ خانه‌خوێش به‌ ئاشكرا گوێی لێبوو
ملازم هه‌ژار وتی : نه‌خێر
خاله‌ خوله‌: هه‌سته‌ با برۆین مولازم هه‌ژار !
كه‌چووینه‌ ده‌ره‌وه‌ كۆپته‌ریش جه‌وله‌ی ده‌كرد ، كوڕم ده‌وێ له‌به‌ر كۆپته‌ر خۆی راگرێ ، چونكه‌ ئه‌ولا ئه‌ولا نازانێ هه‌ر ورشكاتێ له‌وساكه‌ گۆره‌و ده‌شتاییه‌، زه‌رمه‌ره‌كی گه‌وره‌مان لێده‌دا، به‌ڵام خاله‌ خوله‌ كۆپته‌ری له‌ بیر بردینه‌وه‌ ، خاله‌خوله‌ له‌ هه‌ژمه‌تی ورگی و بۆنی ماستی ترشاو ترسی نه‌مابوو
گۆتی : یه‌ك ( ٧٥ )ی به‌سه‌ر ماڵی خانه‌خوێم داباوێم ....... با هه‌موو ناوسێریه‌كه‌ی له‌ گه‌رووی ده‌ربێنم !
هاوڕێیان وتیان : خاره‌ نه‌كه‌ی كۆپته‌ر كه‌شفمان ده‌كا منداڵان وردن ، با ( به‌هه‌تیوی نه‌مینێنه‌وه‌ )

مولازم هه‌ژار وتی : شه‌رت بێ كه گه‌ڕاینه‌وه له بناری چیای دێده‌وانی له ماڵی ( قادر ته‌ها )ی گیسكه‌كی كۆریست بۆ ده‌كوژمه‌وه .

+ داربه‌سه‌رو ئیلینجاغ و سماقه: ئه‌و سێ گونده ده‌كه‌ونه رۆژئاوای كۆیه پێشمه‌رگه سه‌ره‌تاییه‌كانی لێ دروست بوون، هه‌ره‌تی سه‌ختی تیایه.

- خه‌یری / پێشمه‌رگه‌یه‌كی قاره‌مانی كریستیانه‌كانی عه‌نكاوه‌ی بوو .

+ عه‌لی ڕه‌زگه / به‌رپرسی ولاغان بوو خه‌ڵكی گوندی ڕه‌زگه‌ی بناری قه‌راتی دیوینی خانزادی میری سۆران بوو ، په‌رتووكه‌كی له‌سه‌ر بنوسی ته‌واو نابێ ئه‌وه‌نده دڵسۆز و نیشتیمان په‌روه‌ر بوو .

- ئه‌بو حوكمه‌ت / به‌رپرسی مه‌ڵبه‌ندی هه‌ولێری ح . ش . ع بوو ، كریستیانه‌كانی شه‌قراوێ بوو ، مام سه‌عیدی گه‌رمیان نه‌یده‌زانی ناوه‌گه‌ی به ته‌واوی بێنێ كه ( ئه‌بو حیكمه‌ت ) بوو هه‌ر به ئه‌بو حوكمه‌ت بانگی ده‌كرد .

+ قۆریتان: گوندێكه ده‌كه‌وێته سه‌ر جاده‌ی هه‌ولێر مه‌خمور

- جه‌لال پیربال : ئامر مه‌فره‌زه‌ی جاشان بوو، ماڵ و باره‌گای له ناو گوندی قۆریتان بوو، له كاتی مفاوه‌زاتی یه‌كێتی له‌لایه‌ن مه‌فره‌زه‌یه‌كی یه‌كێتی له نێوان هه‌ولێرو قۆریتان له بۆسه‌یه‌كدا ده‌كوژرێت .

+ زندی : له كورده‌واری به ئه‌سپێ و رشك واتا هێلكه‌ی ئه‌سپێ ده‌ڵێن زندی

- پۆریجه : گوندێكه ده‌كه‌ویته رۆژهه‌لاتی هه‌ولێر، چارێگه سه‌عاتێك به ئوتومبێل له هه‌ولێر دووره .

+ بایزئاغـەو سماقـە: دوو گونــدن لـە رۆژئـاوای کـۆیێ . ڕێگاکـانی زۆر سەخت بوو، بۆیە هەردەم پێشمەرگەی لێبوو، بە ناوچەکانی ئازادکراو دادەنران .

- گـیرەی ڕەش : هـەورازەکی زۆر سـەختە ڕێگاکەشـی زۆر ناخۆشـە، لـە ڕەسور بسکۆری بەرەو گوندی بیستانە سەردەکەوێ .

+ قادر تەها: کـادیرێکی ماندونەناسـی حزبـی شـیوعی خـەلکی گونـدی بایزاغـەی بـوو، خزمایـەتی لەگـەڵ موستەشـار( مـەلاعوزێر ) هـەبوو، چەندین جار مەلاعوزێر بەدوای دەنارد، چیت دەوێ بۆتی دەکەم، بەڵام خیانــەت لـە هاورێکانــت بکـە، ئـەو تێکۆشـەرە بـەنانی وشـکی تــادوا پرۆسـەکانی ئـەنفال هـەر لـە هەلـەتی دێـدەوانی بـەخۆی و خێـزان و منالەکانی مایەوە ، تا دوا هەناسە بە سەربەرزی سەری نایەوە .

- ( بەهەتیوی نەمینێنەوە) ئـەو دەسـتەواژەیە خالەخولـە زۆر بـەکاری دەهێنـا، هـەر تووشـی تـەنگاوی بایـە، هـاواریی دەکـرد منـاڵم وردن ، بـا بەهەتیوی نـەمینێنەوە .

**بیرەوەریەکانی هاوڕێ ( شێخە )**
**لەگەڵ خارە خولە**

لە یادمە ساڵی ١٩٨٢ گەر بە هەڵە دانەچووبم مانگی چوار یان پێنج بوو بە مەفرەزە گەیشتینە بەستی شەرغە لەوێ چەند هاوڕێیەکی تازە پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەی حزبەوە کرد یەکێ لەوانە خارە خولە بوو ، کە گەڕاینەوە بۆ ناوزەنگ لە ڕێگا خارە خولە زۆر گورج و گۆڵ بوو رانکو چۆغەرێکی کوردی نوێ و گلاشێکی پەڕۆین و پاك و خاوێن و لە زۆربەمان بە تەمەن تر بوو کەچی لە رۆیشتن دەکەوتە پێش هەمووومان ! هەر لەو یەکەم بینینەوە کەوتە دڵی من و هاورێکانی ، لە ڕێگا بە سەرگوزەشتە خۆشەکانی دڵی هاوەڕێیانی خۆش دەکرد ، دوای گەیشتنمانەوە بە ناوزەنگ خارەخولە چووە سریەی شەهید خدر کاکیل لە دەشتی رۆستێ ، پاش ماوەیەك بۆ سەردانی کردنی منداڵەکانی هاتەوە دەشتی هەولێر هاوڕێانی دەشتی هەولێریش ڕێگایان نەدا بچێتەوە سریەی خدر کاکیل ، خارە خولە لەگەڵ هەر هاوڕێ و مەفرەزەیەك بوایە دەبوە هیمەت و خۆراگری بۆ ئەو هاوڕێیانە ئەو پیاوە بە سەدان هاوڕێی لە لێواری مەرگ ڕزگار کردووە ! خزمەتی گەورەو بچوکی هاوڕێیانی دەکرد بە تایبەتی ئەگەر هاورێیەك نەخۆش یان بریندار ببوایە !

٭ من و خارە خولە و کاروان مورتکەیی و هاوڕێیەکی تر بە مەفرەزە هاتبووینە دەشتی قوشتەپە بە نیازی ئەوەی بەرەو گوندی مورتکە

بچين له ڕێگا بووه دەنگه دەنگ لـه نێـوان مـن و هـاوڕێ كـاروان لەسـەر ئـەوەی كامـه ڕێگـا ( ڕێگـای خەجـه قوڕميـه ) كـه دەچـێتەوە گونـدی مورتكـه هـاوڕێ خـاره خولـه بـه پێكـەنين وتـی : كـوره دەواز لـەو چەقەچەقە بێنن بەشەڕ بێن كەس نيه لێكتان بكاتەوه .

★ بەداخـــەوه لـــه شـــەڕی پۆڕيجـــه هاوڕێيـــەكمان شـــەهيد بـــوو هاوڕێيەكيشمان له ترسان توشی لـەرزو تـا هـات بـوو ، خـاره خولـه دوو لێفـی پێـدادا بـوو خۆشـی خسـتبووه سـەر جەسـتەی هاوڕێكـه گـەرم نەدەبۆوه خاره خولەش به پێكەنين دەی وت بەخوا هەتا ئەو بايـه لـەو كونه بێت ئەتوو قەت گەرم نابيەوه.

★ بارەگامان له چيای قەنديل بـوو لـه كـاتی پشوو هاوڕێيـەكمان هـەر بەشان و باڵی خۆی دا هەڵدەدا كـه پاڵـەوان و چاونەترسـه هاوڕێيـانيش هەر بۆ گاڵتــەو تاقيكردنـەوەی هاوڕێكـه وتيـان : هـاوڕێ خارەخولـه تـۆ ئامير فەسيلی بڕۆ پێی بڵێ مەفرەزەيەك ڕێكخراوە بۆ چالاكيەك بچنه خوارەوه تۆش له دەستەی هێرش داندراوی ، كه خاره ئەو قسەيەی بـه هاوڕێكــه وت هاوڕێكــه وتــی : وەڵا مــن مــاوەی هەفتەيەكــه خــوێن دادەنيشم ! ئيتر له نێوان خۆمان بوو به بەزم .

★ بــه نهێنــی هاتبووينــەوە نــاو شــار كاتێكمــان ديــاری كــرد بــۆ گەڕانەوەمان ! ئەو كاته هات و خارەخوله هاتـه مـاڵی ئێمـه بـەڵام لـەو كاتـه چـەند خزمێكمـان هاتبونـه ماڵمـان و لـه حەوشـەكەمان لـه گـەڵ براكـانم دانيشـت بـون ، منـيش بـۆ ئـەوەی خزمانمـان نـەزانن مـن هاتومەتەوه له ژوورەوە خۆم حەشار دابوو ، برا گەورەم كـه چاوی بـه خارەخولـه كـەوت نەيـدەزانی بـه چ نـاوو پيشـەيەك خارەخولـه بـه خزمـەكانمان بناسـێنێ ! خـاره خولـەش هـيچ يـەكێك لـه ميوانـەكانی

ئەدمناسی ! بۆیە دوای دانیشتن خارە خولە دەیزانی برا گەورەكەم وەستای سەبەی خانووبەرەیە وتی : وەستا بۆ ئەوە هاتوومە بەیانی بچین خانوەك سەبە بكەین .

★ جارێكیان خارەخولە قەدە جلێكی نوێی تیلكۆی بە دیاری لە برادەرێكی شار وەرگرتبوو منیش پێم لەسەر سبوغ داناو پەمپی سبوغ تەقی قاتەكەی هەموو بووە سبوغ و فرێیدا .

★ من شوفێری ئۆتۆمبیل بووم خارەخولەش لە تەنیشتم دانیشتبوو چەند هاورێیەكیش لە دواوەی بوون گەیشتینە فلكەی ( كانی بزرە ) ئۆتۆمبیل لە دەستم وەری گرتوو دایە بەر تەقلان هەندێك هاورێ هیچی لێنەهاتبوو كەچی وەزعی تێكچوو بوو ، خارەخولەش برینێكی گەورە كەوتبووە سەری هاورێ پزیشكەكەمان بە بێ بەنج بۆیان دە دووریەوە هاورێیان دەیان وت : خارە كوی خارە خولەش بە پێكەنینەوە دەی وت : كوو بم شێخە دایكی گاین .

★ بچووباینە هەر گوندێك خارە خولە بە ژنەكانی دەوت عەیشێ كووی زۆر جاریش وادەردەچوو ژنەكان ناویان عەیشێ بوو ، ماوەیەك دوای وەرگەڕانەكەمان خوشكێكم كە ناوی عەیشێ یە هاتە سەردانمان خارەخولەش لە دوورەوە وتی : كچێ عەیشێ ئەتوو چ دەكەی لێرە ؟ خوشكەكەم دەی وت : كاكە كەسێك لە ناوپێشمەرگەكان منی ناسی .

★ خارەخولە ماوەیەكی زۆریش لە دەشتی رۆستێ بووە بۆیە خەڵێكی زۆر دەیانناسی لە یەكێ لە گوندەكانی ئەو سنورە بوین خارەخولە زۆر بێتاقەت بوو ژنێك كە هاوشێوەی خارەخولە بەزمی خۆش بوو گوتی : خارە ئەوە لۆ ئەو ها بێتاقەتی دەڵی شەیتانی بووی ؟

خارەش لە شەرمان ڕەنگی دەم و چاوی پەڕی و بە پێکەنینەوە وتی : گووی سەی بوومە شەیتانی چی !

* شەهید سەرباز یادی بەخێر هەموو جار دەی وت : خارم زۆر شەریفە مەبەستی خارە خولە بوو ، هەموو کات حەز دەکات چوار دەوری بە ژنان شارە بکرێت .

خارەخولەش دەی وت : هەی قەحپە شیر .

* خارە خولە دەی وت : ئێمە تەنها حزبایەتی و چەکداری فێر بووینەو هیچی تر نازانین ڕۆژەك دادێ ئێمە خانەنشین دەکرێین ماڵەوە لەبەر بۆڵە بۆڵەمان دەرمان دەکەن ! دەچینە بن دیواری مزگەوت چەند مام حاجییەك خەریکی دامەنەو ئێمەش خۆمان پێڕا ناگیرێ دەلێینە یەکێکیان ئەم دوو بەردەی بدێ دەبیە ئاغا ! لەوێش بەسەر شکای دێینەوە ماڵەوە .

* ڕێکەوتی ١٧ ی تەمموز ئێمە لە قەندیل بووین شوێنەکەمان وا بوو بەفرمان دەهێناو دەمانتواندەوە بۆ ئاوخواردنەوەو چایی و شیو لێنان منیش ڕادیۆیەکی بچوکم لا بوو لەو کاتە سەدام وتاری دەخوێندەوە لەبارەی ئەو ڕۆژە ئەوەندەی پێنەچوو پەلە هەور ێك بەری ئاسمانی گرتوو تەزرمیەکی زۆر باری منیش وتم : خارە بە خەڵك بڵێن لە مانگی تەمموز تەزرە باری باوڕمان پێناکەن !

خارە وتی : کورە ئەمن خەمم ئەومیە ڕۆژێك دادێ کەس باوڕ بەو خەباتەی ئێمەش ناکات .

## بیرەوەریەکانی هاوڕێ (دڵنیا)
## لەگەڵ خارە خولە

★ ساڵی ١٩٨٧ خارەخولەم ناسی لەگەڵ هاوڕێ خەیامی کۆچکردوو چەند هاوڕێیەکی تری لقی قەرەچوغ چوینە بارەگای بەتالیۆن لە بەستی شەرغە ، هەر لە دوورەوە خەیام گازی کرد خارەخولە خارەخولە هەندەك جوونم لۆ حازر بکە !! کە گەیشتینە بارەگا بەدەم دۆقەکردن لە گەڵ هاوڕێیان گوێم لێبوو یەکێك بە پێکەنینەوە دەیگۆتە خەیامی کەر داکت بگێ ئەوە لە چ دەگەڕێی هەی خۆڕی !
خەیامیش وەکی ئەوەی دۆنی سەیان لە قەلبی دابی تریقەی پێکەنینی دەهات و گوتی ( ئۆخەش درم داکەت ئیسراحەتم کرد)
زووتر بیستبووم کە خارەخولە جوون بە هەموو کەس دەدات بەس ئەوە یەکەم جار بوو دەمدیت و زۆریشم پێ عەنتیکە بوو پیاوێك لەو عومەرەی بە پێکەنینەوە جوون بە خەرکی بدات !
خەیام گوتی : خارە ئەوەش نووە تازە ئیلتیحاقی کردییە جونەکی بەویش بدە ؟ ڕووی لە من کرد گوتی : سەی خۆڕی ئەوە دەرکرای ؟!
ئەمن پێشتر قەت شەڕە جونم نەکرد بوو ئەوەم زۆر پێ ناخۆش بوو ، بۆیە نەك وەکو خەیام پێنەکەنینم بەڵکو بە ڕوویێکی گرژەوە گوتم : ئەمن حەزم لەو سوحبەتانە نیە !
بڕوا بکەن لەو کاتییەوە هەتا ئێستاشی پێوە خارە خولە یەك جونی بەمن نەدایەو زۆر ڕێزی یەکتریش دەگرین ، بۆیە من شاهیدی ئەوە

دەدەم خارەخولە ئەو جونە مزرانە بە کەس نادات ئەگەر خۆی حەزی لێنەبی .

★ سەرهەنگی مەلا نەفتەی وەکی خۆم کەم موو بوو کورە لە منیش کەم مووتر بوو سەرهەنگ هەردەم بێ مووس بوو دیارە پێشووتر دوو سێ جار داوای مووسی لە خارەخولە کردیە و بێزاری کردیە ! ساڵی ١٩٨٩ بوو لە بارەگای نۆکانێ سەرهەنگ دەیویست بچێتە حەمام هاتە لای خارەخولە گوتی : خارە مووست هەیە مووس ؟!

خارەخولەش لەسەرەخۆ گوتی : کورە کەر داکت بگێ ئەتوو مووست لۆ چیە ؟ هەوکە مووسەکی بە تەنیشت دەم و چاوت دا باوێم یەك داوە مووی پێوە نامینێ هانی بگرە ها خۆڕی ، ئیتر بوو بە پێکەنین .

★ کەلتورەك لە پێشمەرگایەتی هەبوو من زۆر دژی بووم ، ئەویش دژایەتی کردنی سەد لە سەدی ساوار بوو ، بە تی ئێن تی و خواردنی حەیوان و ئەو شتانەیان ناو دەبرد ، من هەندەك جۆرە ساوار نەبی دەنا هەر حەزم لە ساوار بووە ، دیارە خارەخولەش وەها بوو حەزی لە ساوار بوو ، هەر لە بارەگای نۆکان بووین لەگەڵ خارەخولەو مام بایزی ڕەحمەتی یەکێ دوو جار ساوارمان لۆ خۆمان لێنایە .

ئەو پیاوە زۆر نەرم و هەمیشە روو خۆشە ئەو خۆشی تەنها بۆ خۆی ناوێ و دەیەوێ بەسەر هەمووانیدا ببەخشێتەوە ئەگەر بە جونێکی مزری هەولێریانەش بێت ، لەگەڵ ڕێزی بێ پایانم بۆ تۆو خارەخولەی هەمیشە خۆشەویست .

**برات نەجم عەبدوڵلا ( دڵنیا )**

## خارەخولە لە یادو بیرەوەری و فانتازیاکانی (کەریم کاکە)

نوسەرو ئەدیبی گەورەی گەلەکەمان ( کەریم کاکە ) لە کتێبی یادەوەری ( گوڵەستێرەکان کوژانەوە ) و رۆمانی ( خەوی پساوەی قەندیل ) ئاوا باسی (خارەخولە ) دەکات کە یەکێکە لە پاڵەوانەکانی نێو رۆمانەکە

* ( خارەخولە ) بە هەر نشێوییەك نشێو دەبیەوە شوێن پێی ئەو پیاوە دیارە ، چاو لە هەر هەورازەیەك دەبڕی جێ پەنجەی ئەو پیاوەی پێوەیە ، بەڵام نیشانەو هێمای ئاڵۆزو نەکراوەن ، من هیچم لەو هێمایانە هەڵنەکراند ، ئەوە نەبێ پێ ناچێ ئەو پیاوە بۆ تامی ئەفسانەش خزمایەتی لەگەڵ ئەفسانەکانی دی هەبێت ، بە ئەفسانە بوونی ئەو پیاوە لە سادەییەوەیە ، ڕەنگە لە سادەییەوە هاتبێت ، لەوەوە هاتووە کە هێندە لە ناو چاوانە ، هێند لە ناو دڵانە ، بە هیچ چاوێ نابینرێ ، منداڵەکانیشی هەر هێندەی منی لە بارەوە دەزانن .

* لەسەر پایەی حەفتەمی پەیژەی ماج ماچم دەچنییەوە ماچێ کە هەرگیز لە چێوەی ئاگای ناگیرێ ، هێندەم لە بیرە ڕاپەڕینێ ڕاپەڕیم نە هیچ ئەسپێ ، نە هیچ میللەتێ وا ڕاپەڕیوە ، ڕێك چۆلەکەیێ بووم خۆم لە ئاقاری پشیلەدا دیتەوە ، ڕابە حەفت خولەك لە ئێشگریەکەت ماوە ئەوەی دوای خۆت بە ئاگا بێنە ! ئەگەر بمزانیایا ناوی ئێشکگریەکەی دوای تۆ بخوێنمەوە لە پەیژەی ماچم نەدەگردی !

ئـه‌م وه‌ڵامـه‌ هـه‌ر بـه‌ جـاریٚ تۆقانـدمی هه‌سـتم كـرد داوم بـه‌ داوی په‌یامبه‌رێكه‌وه‌ بووه‌ ! ئه‌وه‌ دوا جار بوو ناوی من له‌ ئێشكگری له‌ دوای نـاوی خاره‌خولـه‌وه‌ بێـت ، ئـه‌وه‌ دوا جـار بـوو ئـه‌و پیـاوه‌ مـن بـه‌ ئاگـا بێنێت .

★ ئه‌و خاره‌خوله‌یه‌ كه‌ لێی ده‌قه‌ومیٚ ئاگای له‌ كه‌س نامینیٚ ! كه‌سـه‌ك هه‌یه‌ له‌ پشت خاره‌خوله‌ به‌ چاوان نابیندریٚ ، ڕه‌نگی نییه‌ ده‌نگی نییه‌ ، ناهێته‌ خه‌وی كه‌سیش خاره‌خوله‌ له‌ ده‌ست ئه‌و كه‌سـه‌دایه‌ بیٚـوی لـه‌ چۆله‌وانیشـدا ته‌قه‌یـه‌كی نـه‌كردووه‌ ، بیٚـوی نـاتوانیٚ بڕیـاری ئـاو خواردنه‌وه‌ش بدات .

★ برادره‌كـه‌ی گیڤـارا گـوتی: ڕاسپارده‌یه‌كی گیڤـارام پێیـه‌ بـۆ خـاره‌ خوله‌، به‌س نیوه‌ی دنیام له‌ دووی كرد نه‌مدیته‌وه‌، پێم سـه‌یر بـوو كـو خاره‌ خوله‌ ده‌ناسیٚ! به‌ گیڤـارام وت: ده‌زانـی خـاره‌ خولـه‌ خوێنـده‌واری نییه‌!، گیڤارا سه‌ری سوڕماو ئێستاش باوه‌ڕی نه‌كرد، لـه‌ دنیـاییٚ هـه‌موو شتێك ده‌بێت به‌س ئه‌وه‌ نابیٚ و نابیٚ ! وه‌ڵڵا ئـه‌و سوڕ بوونـه‌ی گیڤـارا منیشی خسته‌ گومانـه‌وه‌ ، منـیش بـاوڕ ناكـه‌م خاره‌خولـه‌ خوێنـده‌واری نه‌بێت .

★ برادره‌كــه‌ی گیڤــارا هــه‌موو كــات ســرروودی "لــه‌ قه‌نــدیلی سه‌ربه‌رزه‌وه‌... وه‌ڵامت بۆ ده‌نێرمه‌وه‌...شه‌هیدبوونم شانازییه‌... جوانیٚ ڕه‌نگه‌ نه‌تبینمه‌وه‌"ی ده‌وته‌وه‌!

خاره‌خوله‌ كه‌ گوێی له‌م سرووده‌ ده‌بوو بـه‌ ده‌نگی برادره‌كـه‌ی گیڤـارا هه‌ر بۆ گاڵته‌ پێی ده‌وت: وه‌ڵڵا ئه‌گه‌ر شه‌هید بی له‌ تڕیٚ سه‌ی ده‌چی! ئه‌وجا ئه‌گه‌ر شانازی به‌ تڕیٚ سه‌ی ده‌كه‌ی لۆخۆت شه‌هید به‌.

★ حەفت جەنگاوەری چاوتیژی دنیا دیتە، ڕێیان بزرکردووەو بە دنیا ناکەونەوە، حەفت جەنگاوەری لاسار ، وەك چۆن بنێشت بە قژەوە دەنوسێت ، ئەوها بە قەندیلەوە نووساون و لێی نابنەوە ، حەفت جەنگاوەری هەمیشە بەئاگا ، هەر حەفتیان لە دەستی خارەخولەوە تفەنگیان وەرگرتووە .

★ + خارەخولە نەگاتە ئێرە ، ئێمە بەو بەفرو زریانە بە هەر لایەك دا ڕێگە بگرین تیا دەچین ،

- ئەوجا ئەگەر خارەخولە لێرەبا ، خەمی چیمان بوو ، لە چاوترووکانێکدا دەیزانی ڕێی نزیك کامەیە ، ڕێی دەرچون کامەیە ، ئەو پیاوە وەك دەڵێن هەر بە بن بەفرێ دادەڕوا ، خۆ پێویستی بە بەفرشکاندنیش نیە !

★ لاپەڕەکانی بەفری قەندیلێ زۆرن و هەڵنادرێنەوە ، ژمارەیان پترە لە لاپەڕەی هەموو ئەفسانەو ئایینەکان ، لە ژنە کۆچەرییەکم بیست قسەی من نەبێ ، زۆر لەو لاپەڕانە پەنجەمۆری خارەخولەیان پێوەیە .

★ ئەنگۆ ئەو مەحموود ئێزیدیە باش ناناسن!، دەڵێن عەسکەری بەغداو شامو ئەستەمبۆلێ دەوری چیای شنگالێ دەدەن بۆ ئەوەی ئەو ئێزیدییە لە ناو ببەن، دەیانگۆ هەر عەسکەر بوو پەلەواژ دەبۆوە وەك گەڵای پاییزێ، دەڵێن خارەخولە لە کنەوی فێری تەقە کردن بووە .

★ دەڵێن خارە خولەو بەفرو زریانی قەندیلێ چاو لە چاوی ئێکدی دەبڕن خارە خولە نابەزێ و نابەزێ !

★ خارە خولە ئێستا سەرگەرمی گەرمە شەڕە ، لە کونی تفەنگەوە تەماشای سیمای ژیان دەکات ، لە تەقەی تفەنگەوە دەنگی ژیان دەبیستێ ، پیاوێکی ماندوو ماندووتر لە شەڕ .

★ دوو کەس هەنە لە دنیایێ قەت قەت ڕێیان لێناگیرێ، لە سەر سەری هەوری بێ، لە بن بنی ڕووبارێ بێ، لە بەینی بەفری ئەستوورو عەردی بێ، ڕێی خۆیان دەکەنەوە، ئەو دوو کەسە یەکیان پێشمەرگەیە، ناوی ئەویدیش قاچاخچی نێوان سنوورەکانە، ساردو سەرماو تەلبەندی دنیایێ، ڕێگە لە پێشمەرگەو قاچاخچی ناگرێ!
خارە خولە وتەنی: (ئەگەر قاچاخچیو پێشمەرگە یەك بگرن حکومەت لە سنوورێ ئاودیو دەکەن). لە کتێبی یادەوەری ( گوڵەستێرەکان کوژانەوە )

★ جارەکی لە چیا پێشمەرگەیەك گۆتیە خارە خولە : خارە کەنگێ خۆ رادەستدەکەیەوە ؟
خارە مژێکی قووڵی لە جغارە حەفت ئاگرەکەی داو نازانم دووکەڵ گەیشتە کوێ ،
گۆتی : سەیە ، کەی توتن و پەڕە سیغار بڕا ، لە کن باخی شار دەتبینمەوە .
لە کتێبی یادەوەری ( گوڵەستێرەکان کوژانەوە )

★ خارە خولە دەی ووت ( تا جگەرەو توتن بمێنێ پێشمەرگە لەم شاخانە دەمینێ ! چونکە ئەم دوانەیان وەك بەنزینی شۆڕش وان بۆ پێشمەرگە ) لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ یش دەڵێ ( تا حزب بمێنێ جگەرەش دەمینێ )
لە کتێبی یادەوەری ( گوڵەستێرەکان کوژانەوە )

*خوێنەری بەڕێز*

پێش بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبە لە لاپەڕەی فەیسبوکی خۆم (١٥)پانزە بەسەرهات و سەربوردەم لە ژێر ناونیشانی (لە خارە خولەوە ) بلاّوکردەوە ، خۆشبەختانە لایك و کۆمێنتی هاوڕێیان هاندەری سەرەکی بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبە بوون ، ئەمانەی خوارەوەش بەشێکن لە کۆمێنتەکانی هاوڕێیان کە بە باشم زانی لەگەڵ ئەم کتێبەدا چاپبکرێن .

**Kerim Kake** من کەم گوێ لەو نوکتانە دەگرم کە تەنها نوکتەی رووتی مەبەست نادیارن ، بەلاّم هەمیشە لەو کاتەی خارە خولە نوکتە دەگێڕێتەوە هەناسە لە خۆم دەبڕم چوونکە دەزانم نووکتە بە رووداوی رۆژ و سیاسەت دەبەستێتەوە ، وەختایەك دەمویست قسەکانی ئەو خارەیە بنووسمەوە ، بەلاّم بێ کاتی دەستمی بەست خۆزگە کەسێك لە باتی من هەموو قسە نوکتە ئامێزەکانی خاری خاران خارە خولەی تۆماردەکرد ، خارە خولە ئەفسانە جوانەکەی ناو رۆمانی (خەوی پساوەی قەندیل) و پیاوە جوامێرەکەی ناو ( گوڵەستێرەکان کوژانەوە)ی یادەوەریی من . دەستت خۆش سامانی گوڵ خارە خولە هیزە ، قوتاری مەکە ئەو قسە خۆشانەی هەموو لێ دەربهێنە ، دواتر بە دارشتنەوەیەکترو هونەریتر بلاّویان بکەوە.

**Rzgar Hasare** دەستەکانت خۆش بێت هاوڕێ و برای خۆشەویستم کاکە سامانی قەرەچووغی .... هیوای سەرکەوتوویی و بەردەوامیت بۆ دەخوازم کە لە هەوڵی ئەوەدایت سامان و گەنجینەو پێشهات و قسە نەستەقەکانی خارە خولە جارەکی دی زیندوو بکیتەوەو لە فەوتان و بیرچوونەوە بیانپارێزی ، بەراستی سەرگوزەشتەکانی خارە قەت تام و چێژیان تەواو نابی ، بە دڵنیاییەوە خارە خولە گەنجینەیەکی لە بن نەهاتووی ئەو سەرهات و قسە نەستەقانەیە دووبارە دەستەکانت خۆش .

**هاوڕێ قاسم** / دەستەکانت خۆش هاوڕێ سامان بۆ ئەو توانا جوانەت کەماوەیەکە سەرگوزەشتەو مێژووی هاورێی دێرێن و ماندوو نەناس و خۆشەویستی هاورێیان و جەماوەر خاڵە خولە دەنووسییەوە ، دەست و قەڵەمە ڕەنگینەکەت بەردەوام بێت ، تەنها ڕۆشنبیرە بەهەڵوێستەکان لە زمانی ماندوو نەناسەکان تێدەگەن ، تۆش بەو نووسینانەت گرووتینمان پێدەبەخشیەوە ، خۆشەوستی بێ پایانم بۆ تۆو هەموو ئەو کەسانەی بە دوای مێژوودا دەگەڕێن بەختەوەری بۆ هاوڕێ خاڵە خولەی خۆشەویست دەخوازم .

**Raber Reshid** سلاوو دەستەکانت خۆش هاوڕێ سامانی قەرەچووغی ، کارێکی زۆر چاك دەکەیت سەرهات و قسە نەستەقەکانی خارە بە بیری ئێمەمانان و خوێنەران بهێنەوە ، جارێکی دیکەش کەریم کاکە و خۆت و خارە خولە داهێنانتان نواند ، بە

راستی ئەم بەسەرهاتانە شایانی ئەوەن چاپ و بلاوبکرێنەوەو توانجەکانی کۆتاییش چڕوپڕتر بکرێنەوە ، ئەوەی لە خاڵە خولەوە بێت نیعمەتە نیعمەت , وەك هەمیشە دەستتان خۆش سلاو لە خارە خولەو تەواوی خارە خولەکان .

**عمر خدر کاکیل** / دەستەکانت خۆش هاورێ سامان ، خارە خولە گەنجینەیە گەنجینە دورو گەوهەری لێنابرێن بەردەوام بە ، ئەگەر هەموو بەسەرهاتەکانت تەواو کرد ، ناویان بنێ (رشتەی مرواری شیوعیان ) چونکە هێندەی ڕشتەی مرواری نەمر عەلائەدین سوجادی جوان و خۆشن ، من هەمیشە خارە خولەم لە دلەوە خۆش ویستوە .. زۆر جار دەستی منیشی پڕ لە فستق کردوە .

**زاهیر ئیبراهیم** / دەست خۆش و ماندوونەبی هاورێ سامان کارێکی جوان و مێژوویت کردووە ، دڵنیابە دوای سالانی داهاتوو قورسایی و گرینگیەکەی دەردەکەوێت لە زۆر لایەنەوە پۆستەکان و ناوەڕۆکەکانیان گرینگە ! چ لە دەرخستنی کەسایەتی خارەخولەو چ ڕووداو بەسەرهاتەکان و دواجار توانج و لێکدانەوەکانیش گرینگە ! هیوادارم پەرەی پێبدەی لە هەمووی گرینگ تریش دەست خۆش زمانێکی زۆر شیرینت بەکارهێناوە لە نوسینی بەسەرهاتەکان بە ڕاستی لە توانای هەموو کەس دانیە ، چونکە بە نوسین کردنی زمانی قسەکردن پێویستی بە ئەزموونێکی باشی خوێندنەوەو نوسین هەیە کە خۆت زیاتر ئامادەیی و توانایەکی باشت هەیە بۆ ئەو بوارەو یەکێکی لە

نووسەرو خوێنەرە قولەکان ، هیوادارم هاوڕێیان و بە ناو ڕۆشنبیرانی ناو حزب لە شوێنی خۆ سەرقاڵ کردن بە کاری نەکردەو کاری رووکەشی بیر لە کارێکی وابکەنەوە بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەدەبیاتی حزب و بە ئەرشیفکردنی ژیانی ئەو تێکۆشەرو هاوڕێیانەی کە رۆڵی جوامێرانەو قارەمانانەیان هەبووە لە بەدی هێنانی ئەم قۆناغە ، هاوڕێ سامان گیان دڵنیابە ئەوانەی بە بچوك سەیری ئەم کارەی تۆ بکەن ئەوانەن کە ناتوانن تەنانەت کاری بچوکیش بکەن و لە ڕووی فکری داتەپیون و توانای ئەو کارانەیان نیە ! با سەیری چیڕۆکەکانی عەزیز نەسین و بەسەرهاتەکانی هەژار موکریانی بکەن کە هیچ جیاوازیەکی وای لەگەڵ ئەم چیڕۆکانە دانیە ! گرینگ بەردەوام بیت .

**Salam Omer** ئەو پیاوە تێرامانی زیاتری دەوێ تا باشتر بیجولێنی زۆرترت لێی دەست دەکەوێ ! ئەو پیاوە هەموو ژیانی بۆ ئەوانی دی بووە ، کە دەتبینێ دەگەشێتەوە لە نێو دڵێکی پاکدا هەڵتدەگرێ و دەتپارێزێ ، کاتێك ئەو بەسەرهاتانە دەنووسرێنەوە هەیبەتو قارەمانییەتی تێکۆشەران زیندووت دەکاتەوە بەردەوامیمان پیشان دەدا ، ئەو شایەنی زیاترە سڵاوم بۆی هەیەو دەستخۆشیش لە تۆ دەکەم هاوڕێ سامان گیان بەسەرهاتەکان و ترشوخوێیەکانی تۆ ئاوێتەیەکی بەلەزەتن .

**Babaali Jabary** سڵاو لە خارەخولەی پێشمەرگە و هاوڕێ سامانی خۆشەویست ، خارەی تێکۆشەر چەکەکەی شانت شۆڕشی گەرم

دەكرد و سەرگوزشتەكانیشت پێنوسەكانی نوسەرە بوێرەكان بە بڕشت دەكات ! بە راستی چەكەكەی شانی تۆی پێشمەرگە چەكی دوێنێ و قەلەمی ئەمرۆیە و كەم كەس توانی ئەو چەكە لەشان بكات و ئەمرۆش كەمن ئەوانەی ئەو قەلەمەیان بەقەدا بێت ، ئەگەر بەراووردێك لە نێوان شیرینی نەوتی دەسەلاتدارانی هەرێم و شیرینی گیرفانی خاڵەدا بكەین حكومەت بەهەندی خاڵە خولەی دەمی خەڵكیان شیرین نەكردووە .

**Mahamed Chomani** دەستخۆش هاوڕێ سامان گیان لەگەڵی بەو هەوڵبدە چی قسەی خۆش و بەسەرهاتی هەیە بینووسەوە بێگومان دەبێتە ئەرشیفێكی جوان و دەولەمەند ، دووبارە دەستخۆش ومیانگێڕەوە ، دەشزانم خاڵەخولە بەسەرهاتی لێنابڕێن ، تا خالە خولە مابێ ، قسەی خۆشیش نابرین .

**Kawa Abdullah** دەستت خۆش هاوڕێ سامان گیان من وەك پێشمەرگەیەكی دێرین وهاوسەنگەری گەواهی دەدەم لەسەر قسەكانی خارە هەمووی رویداوە یان رودەدەن ، ئەم سەرهاتەی گۆلكە سۆری وەك خۆی گێڕاوەتەوە ، چونكە من یەكێك بوم لەم مەفرەزمیە ، سلاو لە خالی خالان هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم , تەواوی قسە خۆشەكانی لێوەرگرە هەمووی واقعی ئەم رۆژگارەو ژیانەیە كە ئێمەی تێدا دەژین ، دوایی بیانكە بە كتێبێك ، دووبارە دەست وقەلەمەكەت خۆش بی هاورێكەم .

**Ibrahim Sofi Mahmoud** دەست و فکرت خوش هاوڕێ سامان بۆ گێڕانەوەی ئەم سەرهاتەی پیاوێکی پیادەو بازرگانە مشەخۆرەکان لە سەر زاری خارەخوالەوە ، زۆرن بەسەرهاتەکانی هەژاران و کەمدەرامەتی ناو شارو گوندەکانی کوردستان .... ساماندارانی ئاخر زەمانیش هەر لە فکری بەرتەسك کەنەوەی بوارەکانن .. ڕێژەی موچەکان هێشا بەرزە ڕێکی بخەنەوە ... باجەکان هێشا گشتی نەگرتومتەوە .. بەیتلومالەکەیش هێشا پێویستی بە ئیتاعتی رەعیەتەکانە ... تا خودای مەزن چارێك دەکاتن . سەرکەوتوو بن و هیوای تەمەن درێژیش بۆ خارە خولە دەخوازم .

**Hewa Rash** هەم جوامێری و هەم ژیانی کولەمەرگی زەحمەتکێشان و هەم هەڵوێستەکانت لە دوو توێی حیکایەتێکی خۆشدا تۆمار کردوە , دەست و خامەت ڕەنگینترو هەر بژیت ، سڵاو لە خارە خولەی خۆش مەجلیس .

**Nawzad Jalal** نوسینەکان سەرنج ڕاکێشەرن ... ئەو گوزارشتە سادەو جوانانە هەر لەلای پیاوی خاوەن ئەزمون دەست دەکەوێت ... تەمەن درێژبیت هەرسەرکەوتوبیت وبەردەوام بن .. هیوای تەمەن درێژی بۆهاوڕێی تێکۆشەرو خۆشەویستی هەمووومان خالەخولە دەخوازم .

**نافع مەحمەد** / دەستەکانت خۆش هاوڕێ سامانی بەڕێز بۆ ئەو کارە پیرۆزەی گرتۆتە ئەستۆ بە زیندو کردنەوەی هەموو ئەو بەسەر هاتانەی هاوڕێیان لە ڕۆژگارەکانی خەبات وتیکۆشانی بەسەریان هاتوە ، مێژووی خارە خولەش بەشێکە لە خەبات و تێکۆشانی حزبێك لە سەر دەمێك بوو قەلەمەکان دەترسان لە نوسینەوەی خەباتی شورشگێران ، ئەوان پشت و پەنای کرێکاران و زەحمەتکێشان بون ! با ئەوەی ئەمرۆش بزانن لە ڕابردوو کەسانێکی زۆری نیشتیمان پەروەر لە کاتی گەنجیەتیدا ئەو ئەرکەی لەسەر شانیان بوە ئەنجامیانداوە بێ بەرامبەر گیانی خۆیانیان کردۆتە دیاری بۆ ئازادی ، هاوڕێ خارەخولە یەکێکە لەو جوامێرانە ، سلاو لە هەموو ئەو هاورێیانەی لەو پێناوەدا خەباتیان کرد ، سەربەرزن لە ئاست ئەوانەی خیانەتیان کرد ، بەداخەوە لە سەردەمی خارەخولە و ئێستاش خەلکانێکی نەفس نزم هەرخەریکی دژایەتی میللەتن ، کەچی ئەوانەی خیانەت دەکەن پاداشت وەردەگرن ! قسە کانی خارە خولە هەق وایە بە ئاوی زێر بنوسرێتەوە هێندە جوان و راستن ، پێویستە هەموومان قەدری خارەخولەو هاوشێوەکانی بگرین ، سلاو لە خارە خولەو هەموو هاورییانی کاروانی ریگای ئازادی ،خارە خولە دەریایەکە لە قسەی خۆش ! خارە خولە واتە مێژووی پرلە سەروەری حزب و رەمزی خۆراگری و بەرخودان .

**Hersh M. Ahmad** هەر بژی برا بە ڕاستی جوانی پێکاوە ، پێم باشە ئەو بەسەرهاتانە بلاو نەکەیتەوە تا لە نامیلکەیەکا چاپیان

دەكەیت، وە دەمەوێ ئەوە بڵێم چەند كەسێك هەیە لە ژیانی خۆمدا ناتوانم بە ئاسانی لەبیریان بكەم، خارە خولە یەكێكە لەو كەسانە كە بە قسەی شیرین‌و گاڵتەو نوكتەو نوقلانەی گیرفانی ناخۆشییەكانت بیردەباتەوە، ئاخر ئەو پیاوە نە لە بواری فەلسەفەو نە لە بواری دەروونزانی خوێندویتی بەلام دەقاتی ئەو برادەرانەی لەو بوارەدا خوێندویانە سوودی زیاتری بە دەوروبەری خۆی گەیاندووە، كەواتە دەتوانین پێی بڵێین مامۆستای دەرونزانی. من‌وخێزانەكەمان‌و بەتایبەتیش باوكم زۆر سەربەرزین‌و شانازی بە ماندوویتی هاوڕێ خارە خولە دەكەین، پیاوێك كە هەرگیز نازانێ ماندوویتی چییە، هەمیشە بەشكۆوە بۆ بەرزاییەكانی ژیان دەڕوانێ، وە من لە ئێستاوە ئەو بەڵێنە بە تۆی بەڕێز دەدەم كاكە سامان ئەگەر بیرت لەوە كردەوە كە ئەو بەسەرهاتانە بكەیتە كتێب، ئەوا من دیزاینی ئەو كتێبە خۆبەخشانە دەیگرمە ئەستۆ چونكە لەلایەك تۆ سەرپەرشتی دەكەیت‌و لەلاكەی تر پیاوێكی بە ویقارو مەزن دەبینم.

**Ardalan Hussein** سامان گیان من ئەو پیاوەم لە رێی پۆستەكانی تۆ ناسی دەبێت بمبەیت بۆ لای چونكە پیاوی ئاوا دەگمەنە ، لە دیدی مندا ئەم پیاوە زۆۆۆۆۆۆر تایبەتە ، باوڕ بكە ( ١٠٠ ) بەش بەیەك جار بلاوبكەیتەوە ( ١٠ ) رۆژ بخایەنی ناخەوم تا هەمووی تەواو دەخوێنمەوە ، خاڵە خولە خەزێنەیەكە بۆ ئێمەی گەنج ماوەتەوە یاخوە خوای گەورە تەمەن درێژو تەندورستی بكات .

**Subhi Mahdi** دەست خۆشی بۆتۆ هاوڕێ سامان .. بەڕاستی بە دوای گەنجینەیەکی باشەوەیت ، ئەزموون و بەسەرهاتی خارە .. نمونەی ژیان و تێکۆشانی رۆژگارە سەختەکانن .. کە لەوپەڕی ناخۆشیەکاندا بە نوکتەو بەسەرهاتێکی خۆش فۆرماتی ماندوویەتی و هیلاکی دەکەنەوە ... هیوای تەمەن درێژی بۆ تۆو خارەخولەی روح سوك و تێکۆشەرو ورەبەرز دەخوازم .

**Maghdid Haji** دە ستت خوش هاوڕێ سامان گیان ، بە ڕاستی خارە خولە فەرهەنگی تێکۆشانە فەرهەنگی قسەی نەستەق و خۆشە ، هیوادارم تەندروستی باش بێت وتەمەنی درێژ بێت .

**Xasraw Khalid** سلاو لە خالە خولەو لە تۆش هاوڕێ سامان ، دەست خۆشیت لێدەکەم کە بەم نوسینانە بێبەشم ناکەیت لە قسە خۆشەکانی خالە خولە ، قسەکانی خالە خولە هەمووی پەندە ، هیوای تەمەن درێژی بۆ ئەم هاوڕێ تێکوشەرە دەخوازم .

**Omer Haji** هەر گەشاوەو دەم بە خەندە بن دڵی ئێمەتان خۆش کردووە بە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتانەی ( لە خارە خولەوە ) خوا دڵی خارە خولەو بەرێزتان وکەریم کاکە خۆش کات بە ڕاستی خارە خولە توحفەیە .

**Bakhtyar Shaibi** دەست و پەنجەکانت هەرخۆش بێت کاکی قەرەچوغی دڵی من بە خامەی تۆ هەردەم شادە ، خارە خولە پیاوێك

له جوانی جوانتر ، قارەمانی ڕۆژانی سەخت ، سه ربەرزی بۆ هەموو پێشمەرگه بە ئەمەك و گیان لە سەردەستەكانی ڕۆژانی خەبات و ڕێگای ئازاد ، سلاو له خارە خوله ، سلاو له هەموو ئەو مرۆڤانەی كه گیانی خۆیان له پێناو دۆزی عەدالەتی و مرۆڤایەتی بەخشی ، هیوای تەمەنێكی شادو تەندروستیەكی باش بۆ خالە خولەی تێكۆشەر دەخوازم ، دووبارە دە ستی تۆی گولێش هەر خۆش بێت ، كاكی قەرەچوغی .

**Fateh Mustafa** پۆلێك پێشمەرگه بوین خارە بەرپرسمان بوو فەرهاد بەڕانەتی ، وتی با له خارەی دورکەوینەوە ئێستا جوێنێ ئەدات ، تۆزێ خۆمان دادواوە ، خارە چاوی پێمان كەوت ووتی : هەی كەر داكتان ........ .... بۆ پێ هەلنايێنن ! دەستەكانت خۆش بێت هاوڕێ سامان چاوەڕێ له دایك بوونی ئەم كتێبەین .

**Salar Rwandzi** هاوڕێ سامان دەستت نەیەشێ خارەخوله زۆر باشی پێكاوە من وای دەبینم بۆ زۆر كار پێویسته پرس و ڕا بە خارە خولەكان بكرێت ! سلاو بۆ تۆو خارەخولەو هەموو ئەو مرۆڤە پاك و سادەو تێكۆشەرە ماندونەناسانەی كه ئەمڕۆیان دروستكرد .

**Hawre Rzgar** له سالی ١٩٩٩ كۆنفرانسی محەلی هەلێر ئەنجامدرا كۆنفرانسەكه چوار ڕۆژی خایاند ، دواجار كاتژمێر ١٢ ی شەو كۆتایی هات ، كه له هۆلی كۆنفرانس هاتمه دەر خارە خوله لەوێ

وەستا بوو ، منیش ووتم : خارە کوی ؟ خارە ووتی : هاوڕێ کوبم حزب داکی مەی گا هەی کەر دایکت بگێ حزب !

**Bestun Ahmad** هیوای تەمەن درێژی بۆ خارە خولەی گول و قسە خۆش دەخوازم ، ئەو کاتانەی بە مەفرەزە لە ناوچەکانی بادینان و دەشتی هەولێر دەسوڕاینەوە ، دەچوینە هەرمالێکی خارە دەیووت : عەیشێ کێ لە ماڵێیە ؟ زۆربەی جاریش وا ڕێکدەکەوت ئافرەتەکان ناویان عەیشێ بوو ! وایان دەزانێ خارە خولە ناسیاوێکیانە ! هەمیشە دەیگوت دەزانم کێندەرێت دێشی !

**Shaban Saeed** هیوای تەمەن درێژی بۆ تۆو خارە خولە دەخوازم هاوڕێ سامان گیان ، نمونەی خارە خولەی زۆربی ، هەرچەندە پێم وانییە پیاوی وا جارێکی تر دروست بێتەوە .

**Mamosta Salam Ali** دەستخۆش هاوڕێ سامان .. خارە خولە پیاوێکی ئازا و تێکۆشەرو ماندو نەناس و قسە خۆشە ، هیوای تەمەن درێژی و ساغ و سەلامەتی بۆ ئەخوازم ، قسەکانی خارە خولەی پێویستە بە زێڕ بنووسرێتەوە ، ئاگری ئێمەش هەر ئاوا بێدەنگ بوەستین بەرامبەر خوارزاکانی عەتۆلی ، چونکە خوارزاکانی ئەو زاتە لە ڕادە بەدەر خەلکیان هەراسان کردوە .

**Haval Husin** ده‌ستت خۆش هاوڕێ سامان گیان ، خاره‌خوله جوانی پێکاوه ، هه‌قه خۆت دانوسێنی و قسه‌کانی بکه‌یه کتێبێك .

**Sherko Mahmood** ده‌سته‌کانت خۆش براکه‌م ، هیوادارم بتوانی بیکه‌یته کتێبێك و زۆرترین خه‌ڵك لێی سوودمه‌ند بن

**Abdulla Hamad** هه‌ر له خۆشیدا بن خۆت و خاره خوله ، که ئه‌و به‌سه‌رهاتانه ده‌خوێنینه‌وه زۆر خۆشه‌و پێکه‌نینمان دێت ، ئه‌دی ئه‌گه‌ر خاره خوله خۆی ڕاسته‌وخۆ بۆمان بگێڕێته‌وه ؟ ئه‌وه هه‌ر مه‌پرسه .

**Lawko Allaey** خاره خوله خارو مامی هه‌مووماننه ، چونکه هه‌موو مانی خۆش ده‌وێ خاره گوڵه گوڵی مه‌جلیسه ، هه‌ر له فه‌رمنساوه تا هه‌ولێر چاوی ماچ ده‌که‌م ، سامان زۆر جار خاره ئه‌م فستق و چوکلاته‌ی ده‌دایه منیش ، ده‌یگۆ هه‌ندێکیش بده نه‌هرۆی هه‌ی دایکوئه‌هاوا ئه‌هاوا ...... هههههه ، ده‌ست خۆش سامان گیان چاوت ماچ ده‌که‌م ڕێزتان هه‌یه له‌گه‌ڵ خاره خوله سلاوێکی تایبه‌تیم بۆی هه‌یه .

**Rabar Karim** خاره پیاوی چاکه ، بۆته نموونه‌ی پاکی و ڕاستگۆیی به تایبه‌تی له ناو حزبی شیوعی و خه‌ڵکی شۆرشگێڕو قاره‌ماناندا ، ده‌ستی تۆش خۆشبێت کاکه سامان گیان .

**Sami Salh** دەستت خۆش هاوڕی سامان سڵاوم هەیه بۆ تۆو خاره خولەی بەڕێز ، هاوڕی خاره خوله مرۆڤێكی پڕاو پڕ لە جوانیە هەركەسێك بیبینێ لە شیرینی دەستی بێ بەش نەبوه ! قسەو بەسەر هاتەكانی خاره زۆرن ئەم گێڕانەوەی منیش بابچێته سەر خەرمانەكەی ، بەیانیەكی زوو هەواڵیاندایىێ كەسێك كۆچی دوایی كردووه ، ئێمەش چەند هاوڕێیەك بە نوێنەرایەتی حزب چوین بۆ سەر قەبران ، لە ڕێگادا خاره گوتی : كوڕەك بابی دەمرێت لە كاتی تەلقیندانی دەچێته لای مەلا و پێی دەڵێت ماموستا دوو جاری تەلقینی بدە لە بەر ئەوەی بابم بە جارێك باش حاڵی نابێت ، سەیر لەوەدا بوو ئەو ڕۆژە لە سەر گۆڕستان ماموستا دوو جار بە كوردی و عەرەبی تەلقینی مردووەكەی دا ! لەوكاتەش خاره تەماشای ئێمەی دەكردو سوالفەكەی ڕێگای بە بیرهێنایەنەوه ووتی : بزانە ئیش چۆن ڕێك دەكەوێت .

**Hawre Haji** دەستت خۆش هاوڕێ سامان ، باس كردنی خەبات و تێكۆشانی ئەو قارەمانە بە نووسین تەواو نابێت ، هاوڕێ خاله خوله هەموو ژیانی خۆی لە پیشمەرگایەتی و پارتیزانی بردۆتە سەر توشی زۆر ئازارو ئەشكەنجە بووه ! ئیستاكەش هەموو گیانی پڕە لە ئازار بە هۆی سەرماو سۆڵەی چیاكانی كوردستان ، جارێكیان خاله خولەو هاوڕێیانی مەفرەزمیەك دەبن دەچن بۆ گوندەكانی سەر سنوری توركیا لە ڕێگادا بەفرەكی زۆر دەباریت هەموویان ژیانیان دەكەوێتە مەترسی ، هەر لە ڕێگادا هاوڕێیەكیان لە سەرمان لە ناوباوشی خاله خولەو هاوڕێكانی شەهید دەبێت بە ناوی( ڕەشاد تاهیر مەحمود سێودین ) كە

خـەلکی دیبەگـە بـوو ، بۆیـە هاوڕێیـان پـەنا دەبـن بـۆ یـەکێك لـە لادێیەکانی تورکیـا بـە هاوکـاری خـەلکی ئـەم لادیـە هـاوڕێ شـەهیدەکە دەنێژن ، ئەمە دلۆپێەکە لـە خـەباتی خالـە خولـە ، کـورد ووتـەنی کـێ کـردی وکـێ خـواردی ، دڵنیـام ڕۆژەك دێـت خـەبات وتێکۆشـانی خالـە خولەو ڕێبازەکەی بە ئاوی زێڕ بنوسرێتەوە ئەوانەی مێژووش چەواشە دەکەن دەچنە زبڵ دانی مێـژوو ، ئیسـتاکەش لـە لای ئێمـەی شـیوعی و نیشتیمان پەروەران کەسایەتی خالە خولە و هاوسەنگەرەکانی بـە هـیچ شـتێك قیـاس نـاکرێ ! چـونکە هـەموو سـەرمایەکەیان بریتیـە لـە سەربەرزی ئازایەتی و خەبات و تێکۆشان لە پێناو نیشـتیمانێکی ئـازادو گەلێکی بەختیار .

**بـەلێن قازیخانـەیی** / دەسـتت خـۆش هـاورێ سـامان ، خـارە خولـە پیاوێکی ماندوو نەناسی ئەم کوردستـانەیە ، پێشمەرگەیەکی ئـازاو بـە جـەرگ بـوو ، لـە نـاو هاورێیـان تـا بڵـێ خۆشەویسـت وقسـە خۆشـە ، کەسـایەتیەکی جـەماوەری و خـزم دۆسـتە ، لەگـەڵ هـەر مەفرەزەیـەك دابوایە ئـەوا هاورێیـان زۆر پێـی دڵخـۆش دەبـون ،لـە یادمـە جارێکیـان هـاورێ سـلێمان کـە لەگـەڵ خـارە خولـە دایکیـان خوشـکە دەچـون بـۆ هێرشکردنە سـەر سـوپای رژێمـی فاشـی بـەعس لـە سالانی نۆهەتـەکان سلێمان ووتی : وەڵلا داکم گوتی ئەگەر بوە شـەڕو تەقـە خـۆت لـە پـەنا خارە خولەی بنێ !

خارە خولە گوتی : هەی .... ك .... لۆ ئەمن دیواری چوار ڕێزم ! ئیتر بوو بە پێکەنین لە ناو هاورێیان ، هیوای تەمەن درێژی بۆ خالە خولەی خۆشەویست دەخوازم .

**Farsat Xaelany** دەست خۆش هاوڕێ سامان گیان ، سلاو بۆ تێکۆشەری خۆڕاگر خارە خولەی خۆشەویست کە یەکێکە لە نموونەی هەرە پیاوە پلنگ ئاساکانی سەردەمی پارتیزانی ، بەلام جێگای داخە دەستەڵاتداران نە ڕوویان هەیە نە ویژدان ئەگینا دەبوایە ئەم مرۆڤە مەزنانە وەك سیمبوولی خۆشەویستی ڕێزیان لێ بگیرایە ، بە ڕاستی ژیاننامەو سەروو سەربردەکانی خارە وەك دەریایەك زانست و زانیاری وایە ! پێویستە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەمان کەلکی لێوەرگرین .

**ڕشاد خدر گەڵالی** / سلاو بۆ ئێوە کاکە سامان گیان سلاوی بێ پایانیشم بۆ هاوڕێی ماندوونەناس و تێکۆشەری پشوودرێژ خاڵە خولە ، ناشنایەتی بەندە لەگەڵ خاڵەخولە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٩ لە ڕێگای هاوڕێ قەندیل کوڕی خاڵە مەحمود عەلی مەخمووری ، دوای ئەنفالە بەد ناوەکە بارەگای ئێمە وەك تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە گوندی زەڵێ بوو بارەگای حزبی شوعی عیراقیش لە نێوزەنگ بوو ، بەڵێ ئەوەی خالە خولە ئاماژەی پێداوە زۆر ڕاستە بەشی زۆری ئەو دەسەڵات دارانەی ئێستا بۆ ساتێك گەرم و ساردیان نەبینی ! کەچی ئێستا خاوەنی ئوتێلی پێنج ئەستێرەو مەزرەعەو کۆمپانیای زەبەلاحن ، تێکۆشەرانی هاوشێوەی خاڵە خولە

له خانووی گرێدان بۆیه دەڵێم یەك سەدە لە چەواشەكاری و وشەی بریقەدارو دروشمی زل بە نێوی پیرۆزی نەتەوەو نیشتمان پەیامی كۆی حزب و لایەنەسیاسیەكانە لە خەباتی شاخ و خەباتی مەدەنیدا ، دووبارە سڵاوتان لێ بێت لە دوورەوە سڵاو دەنێرم و چاوی هاوڕێی ئازیزم خاڵە خولە ماچ دەكەم ، دەستی ئێوەش خۆش بێت كاكە سامان قەرەچووغی گەواهی ئەوە دەدەم لە شاخ باسی ئەو پێشبینیەی كرد كە كوردستان ئازاد دەبێت و حزبی شیوعی لە تەلاری نەقابە بارەگا دەكاتەوە ........ هتدێ تۆش ئەو سەرگوزەشتەیەت بە ناوی ( حزبی شیوعی دەگاتە دەسەڵات ) بڵاوكردۆتەوە .

**Shno Majed** دەستەكانت خۆشبن و ماندو نەبیت هاوڕێ سامان بۆ گێڕانەوەو نوسینەوەی ئەم سەرگوزشتانە ، هاوڕێ خاڵە خولە مێژوویەكی پرشنگداری بۆ خۆیی و ئێمەش تۆماركردووە ، هیوای تەمەن درێژیتان بۆ دەخوازم ئێوە جێگای شانازیمانن ، بە هیوای بەردەوامی هاوڕێ سامان لەم ئەركە جوان و رەنگینە .

**Pola Awla** دەستی تۆو خاڕە خولە خۆش هاوڕێ سامان گیان بۆ گێڕانەوەی ئەو یادگاریانە ، بە خوێندنەوەیان من دەگەڕێمەوە ئەو رۆژانە كەوا تام و چێژی تایبەتی هەبوو لە ژیانی ئێمە مانان ، گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتانە مانای وایە شۆڕش هەر بەردەوامە دژی گەندەڵ كاران .

**Jassm Xailani** بـه‌خوا چـیرۆکی خـاره خولـه تـه‌واو نـابێ ، رۆژێکیان خاره خوله به‌قه‌د چیا هه‌رمگه‌ڕا گه‌رمای بوو هه‌ناسه بڕکێی وێکه‌وتبوو ، گوتی : تـاهیر چیت لێکـردم عالـه‌م قه‌سـرو قه‌مـه‌ره‌ی لۆ کوڕی جێ هێشت ئه‌تو شـیوعیاتیت لـۆمن به‌جێهێشت هـه‌ی هـه‌ی ..... رۆژێکیان له گه‌رمه‌ی شه‌ڕه ته‌قه‌ی برا کوژی خـاره خولـه گـۆتی : لێـك دمن لێك ڤێتنامه به‌و حاره‌ی کـوردی ڕزگـار ده‌کـه‌ن هـه‌ی کـه‌ر دایکو .............

**ئه‌حمـه‌د قوتابیـان** / دمسـت خـۆش هـاوڕێ سـامان گیـان بـۆ هه‌ڵدانـه‌وه‌ی رۆژانـی سـه‌ختی خـه‌باتی هاورێیـان ، ئـه‌م کـاره توانـاو سه‌لیقه‌یه‌کی جوانی ده‌وێت و منیش چێژم له خوێندنـه‌وه‌ی وه‌رگـرت ، خاره خوله گه‌وهه‌رێکه بـه‌هیچ سـه‌رمایه‌ك لـه دونیـا بـه‌راورد نـاکرێ ، هـاورێ سـامان لـه لای خـاره‌ی گـۆتم : خـاره سـامان بـه‌ناوو ره‌سمـی تـۆ هـه‌موو هه‌فته‌یـه‌ك دوو بابـه‌تی لـه ئه‌نتـه‌رنێتی بـڵاو ده‌کاتـه‌وه‌و بـه که‌یفی خۆی قسه‌ی به پارتی و یه‌کێتی ده‌رێ ! خاره گۆتی : خوارزا بـه چ حار له ده‌ستی حزبی به‌عس قورتارمـان بـوو نـه‌کوژراین سامان بـه‌و ئاخیره‌ی ده‌یه‌وێ ........ *هههههههههههه* سلاو له خـاره خولـه سـلاو لـه تاکتاکی شۆرشگێرانی کۆمۆنیست لـه باشـوور ، ده‌سـتی هـاورێ سـامانی گوڵ هه‌ر ساغ بن هه‌گبه‌ت هه‌ر پڕ به‌رهه‌م بێت .

**Ferhad Rasul** ده‌ستت خۆش ئه‌م سه‌رهاتانه په‌ندێکی پڕ مانایه ، ته‌مه‌نی خاره خوله‌ش درێژ بێت لـه کـاتی پێشـمه‌رگایه‌تی زۆری لـه‌و مه‌سه‌لانه بۆ ده‌گێڕاینه‌وه .

**KawaHassan** هیوادارم قازیەکان و دەسەڵاتدارەکانی کوردستایش ئەم سەرگوزەشتەی ( پاشایەکی هاوڕەگەز باز ) بخوێننەوە ، دەستی تۆو خارە خولە خۆش بێ کاك سامان قەرەچوغی .

**Nahro Allaey** سڵاو لە خارە خولەی هەموو رۆژگارەکان ، دەستت خۆش هاوڕێ سامان گیان بۆ نووسینی ئەم بەسەرهاتانە لە ژێر ناونیشانی لە خارە خولەوە .

**عماد زەنگەنە** / هەر بژی خالە خولەی فەرماندە بە ڕاستی لە شەڕی گوندی سوریان لە بادینان پێکەوە بوین خالە خولەو شێخ سەلام ئەسکەندەر رۆلێکی کاریگەریان هەبوو لەو شەڕە ، سڵاو لە خالە خولەو قەرەچوغی گیان .

**رفیق زادە** / دە ست خۆش هاورێ سامان هەر بەسەرهاتێك دەخوێنمەوە چاوەڕێی بەشێکی تر دەکەم ، چونکە بەسەرهاتەکان دروستکراونییەو ڕاستەقینەن ، هیوای بەردەوامی و تەمەن درێژی بۆ تۆ و خارە خولە دەخوازم .

**Rěbaz Hashm Mustafa** دەستخۆش هاوڕێم سامان ئەو ڕۆژە هاورێ خارە خولەم بینی چومە لای گوتم : خارە داخوە کوی گۆتی : خوارزا کوبم لەگەر سەیان کەتیمە چارێ !

**Jamal Ahmad** دەست خۆش هاوڕێ سامان گیان بە ڕاستی خارە خولەی خۆشەویست گەنجینەیەکە لە مێژووی حزب و خەباتی شاخ هەر تەمەن درێژ بن .

**Hawre Kawa** یاخوە تەمەنت درێژبی هاوڕێی خۆشەویستی هەموو هاورێیان بۆ قسە خۆشەکانت ، رۆژێکیان خارە خولە لە سەردمی پێشمەرگایەتی بۆ نانخواردن دەچێتە ماڵەکی ژنی خاوەن ماڵەکەش چەند هێلکەیەك بۆ خارە خولە لە رۆنی دەکات ، دیارە لەو کاتەش منداڵی خاوەن ماڵەکەش حەزی دەچێتە هێلکەو رۆنەکەو بە گریانەوە بەشی خۆی داوا دەکات ، ژنەکەش دڵێتە منداڵەکە ئەوە کخەیە بۆ مامەم ئامادە کردیە ! خارەش زۆر برسی بووە ناچار بووە بە بێ دەنگی بیخوا

**هێمن خارە خولە** / دەست خۆش هاورێ سامان گیان بۆ گێڕانەوەی ئەو قسە خۆشانەی باوکی فەرماندەم ، بەس خارە خولەی ئیزن مەدە بەخوا هێشتان قسەی زۆری پێیە .



دەستە ڕاست، خارە خولە، موخلیس، سەرباز ١٩٨٣/٧/١ گوندی هەمزاوەی ئێران



لەدەستە ڕاست، ونس، عەلی چاوشین، مفدید نانەوا، دکتۆر رزگار، خارە خولە بەرەکانی
پێشەوەی شەڕی داعش لە گەرمیان، ٢٠١٤/١١/٢٩



خارە خولە لەگەڵ پۆلێك لە پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی لە دوای پرۆسەی بەدناوی ئەنفال
ساڵی ١٩٨٨ بارەگای نۆکان



خارە خولە لەگەڵ پۆلێك لە پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی لە دوای پرۆسەی بەدناوی ئەنفال
ساڵی ١٩٨٨ بارەگای نۆکان

له ههکبهی خاره خولهوه



له دهسته راست راوهستاوهکان، شاخهوانه سوور، زیوهر، یهحیا ، مهلا عومهر، چهتۆ بهرانهتی، خاره خوله.

له دهست راست، دانیشتوان، شههید پۆلا، ئهبو جاسم، کیفاح، شێخه، شههید زیرهك ١٩٨٦/١١/١٦ گوندی نۆمهره سوور



دهسته راست، هاوڕێ شێخه ، شههید ئارام شاهین، خاره خوله ،



لە دەست راست، زیومر، شێخە، محەمەد نەبو شوارب، خارە خولە، هەژار



لە دەستە راست، بەختیار شەعبی، سامان قەرەچوغی، عەولاّ پۆلاّ، خارە خولە، دێدموان ۲۰۱۷/۳/۱۱

له ئەلبومی خاره خولەوە



له دەسته راست، سامان قەرەچوغی، سەلام عومەر، خاره خوله، ٢٠١٧/٦/٢



له دەسته راست، هاوڕێ سەلیم، خاره خوله، مامۆستا قەرەنی، ١/ی ئایار

له هەگبەی خارە خولەوە




خارە خولە لەگەڵ دوو لە پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی

## سوپاس و پێزانینم بۆ

★ سوپاسی برای بەڕێز هاوڕێ (زیرەك کەمال) دەکەم کە ئەرکی بە چاپ گەیاندنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ.

★ برای بەڕێز رۆژنامەنوس ( رابەر رەشید ) کە پێداچوونەوەی بۆ ئەم کتێبە کردووە .

★ هاوڕێ وبرای بەڕێزم مێژوو نووس مامۆستا ( مەغدید حاجی ) و مامۆستا (ئاکۆ شێخە) کە کارئاسانی زۆریان بۆ کردوومە .

★ برای بەڕێز ( خورشید خدر ) کە هەموو کات هاندەرم بووە بۆ دونیای چیرۆك ، بۆ ئەم کتێبەش چەند ڕێنماییەکی کردووم

★ بەرێز هێرش مەغدید کە ئەرکی نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆکی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ .

★ ئەو هاوڕێیانەی بە رەخنەو تێبینی و سەرنجەکانیان نوسینەکانمیان لە هەڵە پاراستووە .

**ژیاننامەی نوسەر**

★ سامان عەلی ئەحمەد ناسراو بە ( سامان قەرەچوغی ) .

★ ساڵی ١٩٧٥ لە شارۆچکەی مەخمور لە دایك بووە .

★ بڕوانامەی دبلۆم لە بەشی ( کارگێڕی یاسا ) ی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر .

★ لە ساڵی ١٩٩٤ دەستی بەکاری رۆژنامە نوسی کردووە , هەر لەو ساڵەش یەکەم نوسینی لە هەفتەنامەی( رێگای کوردستان) ئۆرگانی ناوەندی حزبی شیوعی کوردستان بلاًوکردۆتەوە .

★ لە ساڵی ١٩٩٥ تاکو ٢٠٠٢ لە بواری راگەیاندنی ( رادیۆ و tv) کاری کردووە , لە دەزگای ڕاگەیاندنی ئازادی هەولێر کە سەر بە حشك بووە وەك ( دەرهێنەر , ئامادەکار , پێشکەشکار , وێنەگر , کاری نوسین) .

★ لە گەڵ ڕاگەیاندنی سەندیکای ڕۆژنامەنوسان و بەستنی یەکەمین کۆنگرە لە ساڵی ٢٠٠١ ەوە ئەندامی کارای سەندیکا ی رۆژنامەنوسانی کوردستان و ئەندامی فیدرا سیۆنی رۆژنامەنوسانی جیهانە .

★ لە ساڵی ٢٠٠٢ تاکو ٢٠١٢ بەرپرسی راگەیاندن و رۆشنبیری ناوەندی ڕێکخراوی یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق بووە .

★ سەرنوسەری گۆڤاری ( ئاسۆ ) بووە کە ئۆرگانی ناوەندی یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق بوەو سیانزە ژمارەی لێ چاپکرا ، لە بەرنەبونی هاوکاری دارایی وەستا .

★ لە ساڵی ٢٠٠٣ەوە پێش پرۆسەی ئازادی عێراق ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر و دەستەی بەڕێوبەری کاتی سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچوغ بووە ، دوا ی روخانی بەعس و ئازاد کردنی مەخمور لە یەکەمین کۆنفرانسی ئەو سەنتەرە لە ٩ / ٣ / ٢٠٠٤ تاکو ٢٥ / ٦ / ٢٠١٢ دەستەی کارگێڕی و بەرپرسی راگەیاندن و رۆشنبیری ئەو سەنتەرە بووە .

* لە کۆنگرەی هەشتەمی یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق کە لە رێکەوتی ٣ / ٥ / ٢٠١٢ ئەنجامدرا بە سکرتێر گشتی ئەو یەکێتیە هەڵبژێردراوە تاکو ١٩ / ٩ / ٢٠١٥.

★ لە ساڵی ٢٠١٢ ەوە خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەی ( ئاسۆی لاوان) بوو کە ئۆرگانی ناوەندی یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق بوو .

★ لە ١٥ / ٦ / ٢٠١٢ تاکو ١٥ / ٦ / ٢٠١٥ ماوەی سێ ساڵ دەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەی ( دەنگی مەخمور ) بووە .

**بەرهەمە چاپکراوکانی نووسەر**

★ ( گەنج لە نێوان گۆڕان و تێکشکاندا ) کۆمەڵێ وتاری رۆژنامەوانییە لە ساڵی ٢٠١٠ چاپکراوە.

★ ( دەنگێك لە پێناو مەخمور) کۆمەڵێ وتاری رۆژنامەوانی تایبەت بە قەزای مەخمورە لە ساڵی ٢٠١٥ چاپکراوە.